# سەگێک لە ئاوێنەدا

## توانا ئەمین

ئەم کتێبە ساڵی ٢٠١٢ چاپ کراوە و ئەم نوسخە ئەلکترۆنییەی دیاری نووسەرە بۆ ئەو خوێنەرانەی ناتوانن کتێب بکڕن.

**بۆ هەرمێ...**

ئەم کتێبە لەسەر پردێکی دارینەی کۆن

بۆ هەمیشە..

بۆ تـــــــــــۆی

جێدێڵم..

# بێ ئۆقرەیی گێڕانەوە

## شێرزاد حەسەن

هەمیشە بە تاسووقەوە چیرۆکەکانی (توانا) دەخوێنمەوە، نەک لەبەر ئەوەی خۆم چیرۆکان دەنووسم.. نەخێر.. ڕەنگە لەم چەند دێڕەدا پتر وەک خوێنەرێک کە بۆ هەمیشە شەیداییم بۆ ئەدەب لە هەقایەتی نەنکم و چیرۆکی چیرۆکنووسەکانی دونیاوە سەرچاوەی گرتبێت، ئەوەی بۆ من گرنگە توانا لاسایی کەس ناکاتەوە. ئاراگۆن-ی شاعیر دەڵێت "هەمووومان لاسایی کەرەوەین!" ئەوەیان لە هونەر و ئەدەبدا ڕەوایە، من لە ئەدەبی کوردیدا جاروبار لاساییکەرەوەم ناسیوەتەوە، جا چ لاسایی نووسەرانی بیانی بووبێت یا لە ڕۆژهەڵات یان نووسەرانی خۆمان، وەلێ توانا خاوەن پەنجەمۆری خۆیەتی، ئەو هەمیشە کەڵک لە ئەزموونە زۆر تایبەتییەکانی خۆی وەردەگرێت و دەقی ناوازەیان لێ دەسازێنێت، بەتایبەتی ئەوەندەی هەستم پێکردبێت، گەشتەکانی ڕووەو وڵاتانی دیکە، ڕۆحێکی دیکەی پێبەخشیووە کە کەم نووسەری کورد وا خێرا دەرەقەتی نووسینەوەی دەکەوێت، گەر یەکێک لە مەرجەکانی ڕەسەنبوونی نووسەر دووبارە نەکردنەوەی پێش خۆت بێت لە فۆرم و ناوەڕۆکدا کە هەموو ڕەگەزەکانی ئەدەبی داستانیی دەگرێتەوە، گەر هێنانەدی زمان و کارەکتەر و باقی پایە و ڕگەزەکانی دیکەی چیرۆک بە مەرجی تازەگەریی و لە کۆن تێپەڕاندن خەسڵەتی سەرەکی ئەو ڕەسەنییەتییە بێت؛ ئەوە توانا بۆ من لە نەوەی نوێدا نووسەرێکی تازەگەرە، بە دونیایەکم دەناسێنێت کە من دەیبینم و هەستی پێدەکەم، وەلێ هەرگیز بەر لەو چیرۆکانە نەمتوانیووە بەو شێوەیە ببینم و وام لێبکات لەسەریان بووەستم و ڕابمێنم.

چیرۆک و ڕۆمان کە بەشێکن لە ئەدەبی داستانیی، بێ بوونی دوو پایە یان ئەستووندەگ دەڕمێن: کە ئەوانیش بوونی یان پەخشکردنی مەعریفەتە بە مرۆڤ و

کێشەکانی لەسەر زەمین، دوومیان چێژە، چونکە پێشکەشکردنی هەر حەقیقەت و مەعریفەتێک بە بێ چێژ و ستاتیکا ئەوکارە ئەدەبییە لەخانەی ئەدەب و هونەر دەچێتە دەر. لەم دەقانەدا و بگرە لە زۆربەی دەقەکانی دیکەی توانا-دا کە لەسەر لاپەڕەی هەفتەنامە و گۆڤارە ئەدەبییەکاندا بینیومە، هەم هەرێمێکی تازەی بوونی خۆی و کەسانی دەوروبەری پێ ناساندووم و هەم لەزەتی داومەتێ، جارجار گەمەکانی زمانیش وا دەبیات کە من ناچارم دووبارە و سێ بارە بیخوێنمەوە تاکو لە نهێنی گەمەکانی تێبگەم، لە هەندێک لەو چیرۆکانەدا بە تایبەتی لە (ڕاپۆرتێک لە کوشتاندینا)دا زمان بە حوکمی پەرتبوونی ئەو هەموو شوێنانە لێرەوە بۆ ئەوێندەرێ بە تەواوی هەم وێڵم دەکەن و هەم ماندووم دەکەن، بەگشتی لە زۆربەی چیرۆکەکانی توانا-دا ڕۆحی پەرشوبڵاوی، خەسڵەتی یەکەمی هەموو چیرۆکەکانە کار دەگاتە ئەوەی کە گرێچن و تان و پۆی چنراوی ناو دەقەکانیش لەگەڵ خۆیدا پەرت و بڵاو بکاتەوە، ڕەنگە بۆ چیرۆکی (ڕاپۆرتێک لە کوشتاندینا) ئەو فانتازیایە تەواو پابەست بێت بە پەرتبوون و ونبوونی مێژوویەک کە بە هەق مێژووی ئێمەیە، خودی زەمەنیش لە ناو لاپەڕەکاندا ونە، زەمەنێک لەدەرەوە بوونی نییە، ئەویش پەیوەستە بە "مەنفی" بوونی نالی لەناو شوێن و زەماندا، هەر بۆیە ئێمەش لە نێو لاپەڕەکان و مۆزەخانەکاندا ون دەبین، هەتا خودی هەقایەتخوان وەک نالی بێ سەر و سەودا و گەڕیدەیە، ونبوونمان لەناو ڕێکەوت و ڕۆژ و ساڵەکاندا دەمانگەیەنێت بە نامەی عەشق و سەرگەردانی و بگرە نامەی نەفرەتیی، هەر هەموو ئەمانەش لەسەر ونبونی نالی خۆی وەستاوە.

گەرچی مەراقمان وا گەورە دەکات کە بزانین چی دەقەومێ، بەڵام بۆ هەمیشە لە نێوان ئێمە و دەقەکاندا مەودایەک هەیە کە لە یەکدیمان دوور دەخاتەوە، لەهەمان کاتدا بۆ ئەو تاکە پەیامە دەگەڕێین کە نووسەر تا کۆتایی لێمان دەشارێتەوە، بەڵام لە هەر هەموویاندا پەیامێکی تاقانە گەر بە من بگات ماندووبوون و وێڵبوونی نووسەرە و بگرە ژمارەیەکی زۆر و بێ شوماری نەوەکەی خۆی، هەر بۆیە لای توانا لە هەموو چیرۆکەکانیدا ڕاناوی (من) بەشی شێری هەیەکە دەگاتە ئاستی دانپێدانان (ئیعتراف) کە پتر و پتر خۆ هەڵکۆڵینە تا گەیشتن بەو (غوربەت)ەی کە ڕیتمی سەرەکی چیرۆکەکان دەهاژوێت. خودی ئەو وێڵبوون و غوربەتە هەتا لە ناوونیشانی زۆربەی چیرۆکەکانیشدا ڕەنگی داوەتەوە.

هـیچ گومـانی تێدا نیـیە نووسـەر هەقـی خـۆیەتی کە کەڵـک لە ئەزمـوونی خـۆی وەربگرێـت. ڕوانینەکـانی لەتەک پاڵەوانەکانیـدا، گەر توانـا خـۆی بێـت یـا کەسـێکی دیـکە، یەکـدی بگـرنەوە؛ وەک تـوخم، تەمەن، پەروەردە و ئاسـتی ڕۆشـنبیریی، تـا دەگـات بە بیـرو باوەڕەکـانی و خوێنـدنەوەکانی، هەلـبەت وەک نووسـەرێک هەقـی خـۆیەتی لەقۆنـاغی ئەزمـونگەریی (تجریبی) دا بێـت هەر ئەوەش پتـر ئـازادی دەکـات چ فـۆرم و چ ناوەڕۆکێـک هەڵبژێرێـت. هەر بـۆیە بەمانـا تەقلیـدییەکەی ڕێـز لەسـەرەتا و گـرێچن و کۆتـایی ناگرێـت. هەتـا بـۆ بـوونی ململانـێ و نـاکۆکی لە ناوئـاخنی ڕۆحـی پاڵەوانـدایە؛ نەک لەبەرانـبەر سروشـت یـان مرۆڤەکـانی دیـکەدا دەبێـت، گەرچـی ململانێکە هەر دوروبەر و ژینگە و مرۆکانی دیکە بۆیان دروستکردووە.

دەکرێـت توانـا وەک چیرۆکنووسـێکی ئەزموونکـار تەماشـا بکرێـت، ئەوەش نەنگـی نیـیە، چـونکە جـار هەیە بـۆ نووسـەرێک کە دەیەهـا سـاڵ دەنوسـێت و کەچـی لەو دۆخـی ئەزمـوونگەرییەدا گەمەکـانی داهێنـانی خـۆی بەڕێـوە دەبـات، بـۆ زۆربەی چیرۆکەکـان ڕووداوێکـی سـێنتراڵ بـوونی نیـیە کە خـزمەت بە تـان و پـۆ و گرێچنـی چیرۆکەکـانی بکـات، پتـر ڕاوکردنـی دۆخێکـی نـاجێگیر و مەراقـی پاڵەوانەکـانە کە شـتی زۆر سـادە و ڕۆژانەی لـێ ئـاڵۆز دەبێـت و بێـئەوەی خولیـای ئەوەی هەبێـت لەنـاو تەنگـژە دەروونـی و ئاڵۆزییەکـانی پاڵەوانەکـان بەدوای چارەسـەردا بگەڕێـت. چـونکە نوسـەر نەک وەک گەمەی کۆتـایی کـراوەی چیرۆکـی نـوێ ئەو کـارە دەکـات، بەڵکـو بـڕوای وایە کە شـتێک نیـیە نـاوی چارەسـەر و ڕزگـاربوونی پاڵەوانەکـان بێـت بـۆ دەرچـوون لەو قەیـرانە ڕۆحیـانەی تێـی کەوتـوون. هەتـا گەورەتـرین تراژیـدیای براکـوژی لە چیرۆکـی (کـچەی زسـتان)دا لە وەهمـی حەزێکـی زۆر هەرزەکـارانەوە ڕوودەدات کە پتـر لە وەهـم و درۆ دەچێـت، کە بـۆ خـۆی دەقەکە ڕەهەنـدێکی تراژیکۆمیـدی وەرگرتـووە، بەڵام بە درێژایـی چیـرۆکەکە کە پـاڵەوان وا لەو دونیـا دەهگێـڕێتەوە پتـر لە دانپێـدانانێکی هەرزەیەک زیـاتر نیـیە کە بۆخـۆی گومـانێکە لە گەورەتـرین تراژیـدیای نـاو ژیـانی سیاسـی ئـێمەدا. لەمـڕۆکەدا کـورتەچیرۆک یەک فـۆرمی نیـیە، دەکرێـت سـکێچێکی تـۆکمە و دامەزراو فۆرمێـک لە کـورتە چیـرۆک کە پتـر لە ڕەشنووسـی یەکەمـی دەقەکە دەچێـت، توانـا پتـر ڕووی لە سـکێچە کە ڕۆحێکـی کێویـانە و بەلەسـە دەبەخشـێت، لە دووسـەد سـاڵێ ڕابـردوودا فـۆرمی چیـرۆک دەیەهـا ڕوخسـاری بـووە، بـۆ ئـێمەش لە نیـوەی سـەدەی ڕابـردوودا هەمـان فـۆرم و نـاوەڕۆک و زمـانی جیاوازمـان ئەزمـوون کـرد، توانـا و نەوەکەی بۆخۆیـان

عەودالّـــی ئەو سەرکێشـــی و گەمەیەن، بەڕۆح و ئیقـــاعی جیـــاوازەوە. لە هەمـــوو چیرۆکەکانیـــدا تەواو دەســـت دەگـــرێتەوە هەتـــا بـــۆ دامەزرانـــدنی ئەو تـــان و پـــۆ و گرێچنەی کە هەڵیدەبژێرێت، کەمترین خەسارەت دەدات.

بەڵام چـــڕی و چوارچێـــوەی بەرتەســـکی چیرۆکەکـــان بـــوارێکی کەمتـــری داوە بە دینـــامیکی کـــارەکتەر و پاڵەوانەکـــان بەوەی کە (فلات)بـــن نەک کـــارەکتەری بـــازنەیی، بە واتـــا تـــاک ڕەهەنـــدیی کە کەمتـــر بـــوار دەدات گـــۆڕانێکی گەورە لە کـــردار و ڕۆحـــی پاڵەوانەکـــانی بگۆڕێـــت، واتـــا لەوەدا جیـــاوازن کە بـــێ ئـــۆقرەن، بەس وەســـتا و جێگیـــرن وەک بـــاری ڕۆحـــی و دەروونـــی کە ئەوەش بـــۆ هەمیشـــە بـــۆ چیـــرۆک دەســـت نـــادات، ئەگەرچی پتر لەڕۆماندا چاوەڕێی گۆڕانکاری و دینامیکییەت پتر دەسازێت.

زۆربەی پاڵەوانەکانـــدەجووڵین، بەڵام کردارێـــک نیـــیە بـــیکەن، گەر لە چیرۆکـــدا هەر پاڵەوانێـــک و کرادارێـــک بەیەکەوە بەســـتراون، قەیرانـــی ئەو پـــاڵەوانە بـــێ ئـــۆقرانە ئەوەیە کەلە دوای کـــرادار و ڕووداوێـــکەوە هـــاتوون، یـــان بەر لە کـــردار و ڕوداوەکـــان هـــاتوون، واتـــا لە مۆلەقـــدان. هەڵواســـراون، نـــاجێگیرن، نە کاتەکـــان و نە شـــوێنەکان بـــۆ ئەو کـــارەکتەرانە ئەوەنـــدە بەرجەســـتە نـــین تـــا تێیـــدا بســـرەوون، زۆریـــش هەوڵنـــادات شتەکان و کەسەکان و شوێنەکان ببینین، بەڵکو گەرەکیەتی هەستی پێبکەین.

# توانا ئەمین..
# لەپڕ بیری دەکەوێتەوە کە چیرۆکنوسە..!

**ئیسماعیل حەمەئەمین**

ئەزمونی توانا ئەمین ئەزمونێکی تایبەتە، ئەزمونێکە دەبێت لە گەڵیدا بژی، دەتوانم بڵێم شێوازی ژیانێکە و لە کڵێشەی گێڕانەوەدا لەخۆی دەدوێت، ئەزمونێکە زۆر سوبێکتیڤانەیە، خودگەرایی و تاکڕەوە، ڕەشبینێکی هارە لە بەرامبەر جوانی و ناشرینیەکانی ئەم دنیایە. من خۆم کاتی خۆی تێکستەکانیم لە ڕێگای ئینتەرنێتەوە خوێندەوە، بێ ئەوەی بیناسم، کە چیرۆکی (گوڵی مریەم)م خوێندەوە، هەر هەمان شەو بە یەک نەفەس تا بەرەبەیان لەسەر ئەو چیرۆکەم نوسی، ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام ئەو ڕۆحی گێڕانەوە پڕ لە نیگەرانەیە سنووری گێڕانەوە دەبڕێت بۆ شتێکی دیکە، کە دەتوانم بڵێم: دووریەکی چڕی نەبینراوی وەڕسیە لە جیهان، لەدنیای هەبوو... بێ ئەوەی خۆی بناسم، ڕەدووی چیرۆکەکانی کەوتووم، سەرنج ڕاکێشەربوون لای من.. ئەوەی سەرنج ڕاکێشەرە لە دونیای توانا-دا ئەو قوڵ بوونەوەیە لەناو ناخی کاراکتەردا.. لەناو ناخی پاڵەوانی چیرۆکدا، سەفەر دەکات بەناخدا ، لێرەدا (شەپۆلی هۆش)ی (جێمس جۆیس)م بیردێتەوە، (بلوم)ی پاڵەوانی چیرۆکی یۆلیسیس، ئێرلەندیەکان و وێنەی هونەرمەند لەتافی لاویدا.

سەیر لەوەدایە چیرۆکی کەسەکان لەلای توانا لەچیرۆکی جیهان، لە چیرۆکی دونیای دەرەوە جودا نابێتەوە، دەرەوە و ناوەوە بە شێوەک لەنێو یەکتردا تێکەڵ بوون کە زەمەنی شوێن و زەمەنی خود، سنورەکانی ئۆبێکت و سوبێکت تێکەڵ بەیەکتر دەبن، لەچیرۆکی (گوڵی مریەم)دا هەست بەو گەمەیە دەکەین لەنێوان سوبێکت و ئۆبیکتدا، لەنێوان خود و شوێندا، لەنێوان شوێن و ڕۆحی پاڵەوانەکەدا. ئەمە جگە لەوەی ئەو توخم و ڕووداوانەی ئەو کاری لەسەر دەکات چەندە لە دونیای واقیعیدا بوونیان هەیە ئەوەندە واقیعێکی سایکۆلۆجین، ئەوەندە پابەندن بە ئازاری کەسەکانەوە، لەچیرۆکی (سەگێک بێ تاقەتە.. زۆر)، تەنیایی سەگ و خاوەنەکی و پاڵەوانی چیرۆکەکە تێکەڵی یەک فەزای سێکسوالی نادیار

دەبن، لێرەوە سەگ لەم وڵاتە چەندە تەنهایە ئەوەندەش لەکاتی پەرپیندا جووتە ، دەنا لەسەر لێواری ڕێگاکاندا سەگ دەبینین وەک ئاژەڵێکی هەمیشە بەژێر ئۆتۆمبێلەوە بوو، بەمەش ڕەمزیەتی سەگ لە سۆفیا وەک لەچیرۆکەکیدا هاتووە بەپێچەوانەی ئەو وێنە تەنهایە کە لەسەر لاڕێگەکان بەژێرەوە بووە، لێرەوە سەگێکی تر لەبەردەم پاڵەواندا خۆی ئامادە دەکات تەنها نییە، لەبەردەم هەرشەی مرۆڤدا، بەڵکو، پاک و خاوێنە. لەم خاڵەوە ئەو تاڵییە سەختە هەست پێ دەکەین لەناخی پاڵەواندا، ئەو وەستان و سەرسامیە کوردییەی کاتێک لەئاوێنەی دنیای دەرەوەی خۆماندا، وێنە پڕ غوربەتی و کاراکتەرە شێوەواکانی خۆمان دەبینین، لەم چیرۆکەدا، کاراکتەری سەگ و پاڵەوانی چیرۆکەکە تێکەڵ دەبن، من وام هەست کرد کەپاڵەوانە کوردییەکە وەک ئەو سەگە کوردییە وەهایە تراژیدیا و دڵ ڕەقی کۆمەڵگەی کوردی بیر دەکەوێتەوە، کاتێک بەرامبەر سەگێکی دیکە دەبێتەوە لە سۆفیا یان لە ئەڵمانیا. ئەم تەکنیکە چەندە لە (شەپۆلی هۆشەوە) نیزیکە، ئەوەندەش ڕیزپەڕی دەکات بەتێکەڵ کردنی کارەکتەر، بەگفتوگۆی نێو ڕۆحی پاڵەوانەکان، جار جارەش توانا خۆی ناگرێت و لەسەرێکی دیکەی تێکستەوە چەند دێڕێک دەڵێت و دەبێت هەمیشە وەک گێڕەوەیەک ڕستەیەک بڵێت، ڕستەیەک دەیەوێت تەنها تەعبیر بێت لەسوبێکتی خۆی، خۆی و کەسی تر نا.

جوانترین خاڵ لەتەکنیکی چیرۆکی توانا، ئەوەیە تەکنیکێکی ڕوون و ئاشکرایە کە ئەزموونی چیرۆکی ئێمە زۆر کەم ئەم جۆرە تەکنیکە بەخۆیەوە دەبینێت، چیرۆک هەیە کە دەیخوێنمەوە لە سەرەتاوە پەخشانە تا کۆتایی، ڕووداو تێدا لاوازە و لەسەر ئاستی نەبووندایە، خوێنەر ناتوانێت گفتوگۆی خۆی هەبێت لەگەڵ ڕووداو و کەسەکاندا. ئەم دیاردەیە من بێزار دەکات.. ئەم جۆرە چیرۆکە جۆرێک لە تەمومژیی پێوە دیارە بۆ ئەوە نییە خوێنەر لە پرۆسەی خوێندنەوەدا ڕەمزیەت و گرێکانی بدۆزیتەوە، دوای پێچاو پێچی ڕووداوەکان بکەوێت، نەخێر، بەڵکو لە لاوازیەوەیە لە دروستکردنی ڕووداو و کەس و شوێن و مەنەلۆژ. بەڵام توانا بەئاراستەیەکی تر کار دەکات بەئاراستەی ئەوەی چیرۆکەکانی جۆرێک لەڕوونی زمانەوانی تێدایە، بەمانای وشەکان ڕوونن، دەربڕینەکانی کورت و چڕ و تیژن. هەموو ڕستەیەک خاوەنی بیرۆکەیەکی تایبەتە.. دەتوانین بڵێین لە چیرۆکی توانادا

زۆرجار لە بڕگەیەکدا پێنج بیرۆکەت دەداتێ، کەئەمەش یەکێکە لەو تەکنیەکە سەرکەوتووانەی کە توانا توانیوێتی بەکاری بهێنێ..
لە چیرۆکێکیدا کە من لەگۆڤاری کۆنسێپت-دا خوێندمەوە بە ناونیشانی (من لە بلووردا یان نارەوەنێک لەسەر ئاو) خەمێکی زۆر گەورەی ئونیڤێرسالییە، خەمێکە لەمەڕ هێرشی تەکنیک بۆ سەر پرسیاری (بوون)، ،بەوەی هێلکەکانمان، سپێرمەکانمان بەرە کوێ دەڕۆن..؟! ئەمە پرسیارێکی وجودیانەیە، پرسیارێکی مۆڕاڵیانەیە، تا ئێستا ئەم گفتوگۆیە کراوەیە بەوەی دەبێت چ مۆراڵێک ڕێگە بدات دەست کاری جینات و شریتی سیفاتی مرۆڤ بکات پێش دروست بوونی، ئیدی هەڵبژاردنی سروشتی چ مانایەکی دەبێت؟ خەمێکی جوانە لەم چیرۆکەدا. پرسیارێکی ئونیڤێرساڵییانەیە، بەوەی ئێمە بەرەو کوێ دەڕۆین، وە مناڵەکانی ناو شوشە چۆن دروست دەبن.. وە منالّی ناو شوشە چییە؟ وە منالّی ڕاستەقینە چییە؟ وە گەورەبوون لە کوێدایە و پیربوون لەکوێدایە و وە گەنج بوونەوە لە کوێدایە..؟
گەر بگەڕیمەوە سەر خود (سوبێکت)، خودی چیرۆکنووس خۆی، دەتوانم بڵێم کە خودێکی هەمیشە پرسیارکارە لەوجود وەکو هەموو چیرۆکنوسێک بەلاّم لای توانا حوزنێکی قووڵ هەیە، برینداریيەکی قووڵ هەیە کە تۆ لەهەموو چیرۆکەکانیدا وەکو دەنگێکی تایبەت، هاوتەریب لەگەڵ گێڕانەوەکانیدا هەستی پێ دەکەیت.. ئەم غەمباریە، ئەم برینداریە، بووە بەخودیکی گێڕەوەی زۆر جوان. من هەمیشە گوتوومە کە توانای (توانا ئەمین) لەوەدایە ئەو هەموو غوربەتە، ئەو هەموو بریندارببونەی لەناو دنیادایە، ئەو هەموو ئازارەی توانیوێتی بیکات بەگێڕانەوە. بێگومان ئەمەش جیاوازی نێوان خودی چیرۆکنوسە لەیەکێکی دیکە، گەر ئازار نەکرێت بەتێکست، وەگەر نەکرێت بە کاری ئاوەها، لەو بڕوایەدام جگە لە لاّلانەوە و پاڕانەوەیەک نەبێت، وە گەڕان بەدوای بەسەرچوودا نەبێت، هیچی تر نییە.
توانا یەکێکە لەو نووسەرانەی من دەڵێم توانایەکی سەیری ڕۆمان نووسینی هەیە، بەلاّم ڕەخنەی من زۆرجار لەو ئەوەیە، دوای شیعرییەتی خۆی دەکەوێت، دوای شیعرییەتی دنیا دەکەوێت، زۆرجار لەسەر فاتورەی ڕووداوو، سوبێکتیڤیەتی، خودگەرایەتی، وەهای کردووە، کەتەنها دوای دونیای خۆی بکەوێت، بەجۆرێک لە پرێکدا ئەدەبی بیر دەکەوێتەوە! بەوەی، کە پێویستە هەموو ئەمانە بکەم ئەدەبی

وە ئیتـــر چیرۆکێـــک دێـــتە دنیـــایەوە. بەمانـــای لەپـــڕ بیـــری دەکەوێـــتەوە کە چیرۆکنووســـە.. چیرۆکـــی توانـــا هەمیشـــە خـــاڵی وجودیـــانە، پرســـیاریی زۆر گەورەی ئینســـانی تێـــدا خـــۆی حەشـــارداوە.. لەبەر ئەوە کەســـی و ئەدەبـــی، ژیـــانی کەســـیی خـــۆی و برینـــداربوونی خـــۆی لەگەڵ تێکســـتەکانیدا ئـــاوێتەبوونێکی زۆر جـــوانی هـــارمۆنین، لە زمـــانێکی بـــاڵای چیـــرۆک ئـــامیزانە و گێـــڕانەوە ئامێزانەیـــان لە خۆیانـــدا بەرجەســـتە کـــردووە، بە بـــێ ئەوەی لە درێژکـــردنەوەی ڕســـتەکان خـــۆی نـــوقم بکـــات.. مـــن لەو بـــڕوایەدام خـــوێنەری توانا دەبـــێ خـــوێنەرێکی تـــایبەت بێـــت، ناتوانێـــت مێگەلـــی بێـــت و دوای ئەدەبێـــک بکەوێـــت کە هەمـــووان بەجەمعـــی پیـــی سەرســـامن، خـــوێنەرێکە دوای جەمـــاوەریەت ناکەویـــت، دوای چێـــژی گشـــتی ناکەوێـــت، بەمانـــای خـــوینەرێکە زۆر ئیندڤیـــدوال و تەنهـــا و خـــودی. خـــوێنەرێکە خـــودێکی ڕامـــاوە لە دونیـــا، سەرســـامە بە دونیـــا، بە ئـــازار چەشـــتنی خـــۆی.. توانـــا هەمیشـــە لە بیرکـــردنەوە ڕا دەکـــات... وە هەمیشـــە بەرەو ئەوە دەمـــان بـــات کە ڕابمێنـــین لە دونیـــا، لە ئـــازار تـــێ بگەیـــن، لەو ساتانەشـــدا کەچیرۆکـــی ئەو دەخـــوێنینەوە، هەســـت دەکەیـــن شـــتەکان لەشـــوینی خۆیاندا نین..

# توانا ئەمین..

## نەوەی دووەمی دوای ڕاپەڕین، شەڕێک لەگەڵ تارماییدا

**کاروان عومەر کاکەسوور**

(هەر نووسەرێک دنیای تایبەتیی خۆی هەیە).

کەم کەس هەیە بە شێوەیەک لە شێوەکان ئەمەی نەگوتبێت... بەڵام ئەو دنیایە لە کەیەکەوە دەستی پێ کردووە و تاکەی درێژەی دەبێت؟ ئەمانە هەمان ئەو پرسیارانەن، کە هەمیشە لەبارەی دروستبوون و بەردەوامبوونی گەردوونەوە کراون و دەکرێن... بەڵام نووسین دروستکردنی دنیا نییە، بەڵکو هەوڵێکە بۆ تێکشکاندنی ئەم دنیایە. ئەمە باوەڕێکە پێم وایە لە ئەنجامی خوێندنەوەیەکی هەمەلایەنانەی ئەدەبی نووسەرانی نەوەی دووەمی دوای ڕاپەڕینەوە پێی دەگەین، کە (توانا ئەمین) یەکێکە لە دەنگە دیارەکانی. ئەو چیرۆکنووسە ئەوەندەی مەبەستیەتی دنیای خۆی وێران بکات، ئەوەندە لە هەوڵی دروستکردنی دنیادا نییە. ئەمەش پێوەندیی بەو فاکتە سۆسیۆلۆژییەوە هەیە، کە ئەم نەوەیە ئەزموونەکانی خۆی لەناودا دامەزراندووە. دەبێ هەر لە سەرەتایشەوە بڵێین مەبەستمان لە (نەوە)، کۆی ئەو ناوانە نین، کە لە سەردەمێکی دیاریکراو و لەناو رووبەرێکی جۆگرافیی دیاریکراودا ئامادەن، بەڵکو ئەو تێڕوانینە زیاتر چۆنایەتی دەگرێتە، نەوەک چەندایەتی.

لە کۆنتێکستی پێوەندیی (من) بە (ئەوی دیکە)ەوە دیالۆگ رووی لە ڕەگەزێکی دیارکراو و جۆگرافیایەکی دەسنیشانکراووە نییە، بەڵکو ئاڕاستەیەکە بەرەو ڕەگەزی گریمانی و جۆگرافیای وەهمی. ئەمە بەگشتی یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی ئەدەبی نەوەی دووەمی دوای ڕاپەڕین، بۆیە نەوەکانی پێشوو،

بەهۆی نەبوونی، یان لاوازیی ڕەخنەوە، کەمتر توانیویانە لە زمانی ئەم نەوەیە تێبگەن، بەوەی ماتریالی گێڕانەوە پێکهاتەیەکی جیاوازی لەگەڵ ماتریالی گێڕانەوەی نەوەکانی پێشوودا هەیە. ئەوە جیاوازیی پرۆبلیماتیکی پێوەندیی نێوان واقیع و هۆشە لەسەر هەردوو ئاستی هەستی و ئەقڵییەوە. تێڕوانینی ئەم نەوەیە بۆ واقیع و وێنەکانی، تێڕوانینێکی جیاوازە و لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییە سۆسیۆلۆژییانەوە بەدەست هاتووە، کە لە نیوەی دووەمی نەوەدەکانەوە، لەناکاو و خێرا لە کۆمەڵگای ئێمەدا دەرکەوتن و درێژەیان هەیە. ناکرێت نەڵێین سەردەمی ئەم نەوەیە، سەردەمی کۆتایی خەونی ئایدۆلۆژیایە لەناو کەلتووری ئێمەدا. ئەم نەوەیە لەناو عەدەمێکدا پێگەیشتووە و بیری کردۆتەوە، بۆیە بە مانا ستانداردەکەی پێشوو نە پەیامی هەبووە و نە ویستوویەتی پەیام بە سەرچاوەیەکی دیاریکراوەوە بگەیەنێت، بەڵکو ئاراستەکانی گەیاندنیش لای ئەم نەوەیە بەرەو عەدەمە. ئەم نەوەیە نەک مەبەستی نییە نووسین بکاتە ئامرازێک بۆ گەیشتن بە بەهاکان، بەڵکو بەپێچەوانەوە لە هەوڵی تێکشکاندنی هەموو ئەو بەهایانە دایە، یان بە مانا (ڤیبەر)ییەکەی خەمی گەورەی ئەم نەوەیە ڕزگار بوونە لە بەهاکان. ئەم نەوەیە پێش ئەوەی لەناو ئەو واقیعە نوێیەدا نیشتەجێ بێت و ئەزموونی بکات، لێی یاخی بووە. ئەگەر ئەم ئاراستەیە هەتا ئێستا بەڕوونی دەرنەکەوتبێت، ئەوا پێشبینیی ئەوە دەکەین، لە ئایندەدا چاکتر نیشانەکانی ببینین. ئەگەر لە دیدی (ئیمیل دۆرکهایم)ەوە بڕوانین، کە پێی وایە زۆربەی مەیل (Tendency) و بۆچوونەکانمان دروستکراوی خۆمان نین، بەڵکو لە دەرەوەی خۆمانەوە بۆمان دێن، ئەوا دەبینین ئەو واقیعە نوێیە چ لەسەر ئاستی کات و چ لەسەر ئاستی شوێندا کۆمەڵێک مەیل و بۆچوونی نوێی بەسەر ئەم نەوەیەدا سەپاندووە. ئەو واقیعەی (توانا ئەمین)یش وەکو هەندێک لە نووسەرانی دیکەی نەوەکەی ڕووبەڕووی دەبێتەوە و لە ڕێگای زمانەوە سیماکانی نیشان دەدات، واقیعێکی گریمانییە، بەڵام وێنە ئۆرگیناڵەکانی لەناو ئەو واقیعە نوێیەدا هەن، کە وەکو زووتر گوتم بەهۆی نەبوونی، یان لاوازیی ڕەخنەوە، ئەو وێنانە تا رادەیەکی زۆر لای نەوەکانی پێشوو شاراوەن، یاخود تەمومژاویین، چونکە پرۆسێسی فانتازیا گومکردن و سڕینەوەی ئێجگارەکی وێنەکانی واقیع نییە، بەڵکو گۆڕینیانە لە ڕووی قەبارە و شێوە و جۆردا. تێگەیشتن لە زمان و وێنە بەرهەمهێنراوەکانی ئەم نەوەیە بەندە بە تێگەیشتن لە کۆنتێکستی ئەو زمان و

وێنانە لەم هەلومەرجە مێژووییە و لەناو ئەو ژینگە کۆمەلآیەتی و کەلتوورییەدا، کە خاوەنی تایبەتمەندیی خۆیەتی، بەوەی کۆنتێکستی کەلتوور کاریگەریی گەورەی لە پێکهێنانی کۆدەکاندا هەیە و کردنەوەی ئەو کۆدانەش دیسان بەندە بە تێگەیشتن لەو کۆنتێکستە. بە مانایەکی دیکە ئەگەر تایبەتمەندیی نەوەکانی پێشوو بە حوکمی لەیەکچوونی کۆنتێکستی مێژوویی و جۆگرافی و سۆسیۆلۆژیی نێوانیان، کەم و زۆر لە یەکتر دەچوون، ئەوا تایبەتمەندیی ئەم نەوەیە خاوەنی جیاوازییەکانی خۆیەتی. ئەگەر نووسین پرۆسێسی نووسینەوەی یادەوەری بێت بەپێی یاساکانی ناوەوەی خود خۆی، ئەوا یادەوەریی ئەم نەوەیە دەکەوێتە دەرەوەی کات و شوێنەوە، بۆیە داهێنانی زمانێک، کە بتوانێت گوزارشت لەم عەدەمە بکات، زەحمەتترە لە هەموو ئەو زمانانەی پێشوو، کەم و زۆر دەیانتوانی بە پاڵپشتی ئایدۆلۆژیا گوزارشت لە واقیعی خۆیاندا بکەن. رواری (العفویة Spontaneous)، وەکو شێوەیەک لە شێوەکانی بەرەنگاربوونەوەی دەسەلآتی کرۆنۆلۆژیای مێژوو، یەکێکە لە سیفەتەکانی بەرهەمی ئەم نەوەیە بەگشتی و لای (توانا ئەمین) بەتایبەتی. خۆی بە شێوازێکی دیاریکراوی دەربڕین و چەند وێنەیەکی چەسپاوەوە نابەستێتەوە. ئەگەر هەتا ئێستا ئەم نەوەیە نەیتوانیبێت تێکستی گەورە بەرهەم بهێنێت، ئەوا هۆکارەکەی نەبوونی توانا نییە لای ئەم نەوەیە، بەڵکو ئەو واقیعە توانایەکی گەورەتری لە واقیعەکانی پێش خۆیەوە پێویستە، بۆ گواستنەوەی سیماکانی لە ئاستی جێگیرییەوە بۆ ئاستی جووڵە. بە مانایەکی دیکە بۆ گواستنەوەی دەرکەوتەکانی لەسەر ئاستی کات و شوێنی فیزیکییەوە بۆ کات و شوێنی میتافیزیکی. دیارە هەموو هونەرێک بەرهەمی ئەزموونە پێرسۆنالییەکانی نووسەرە لەناو کات و شوێندا، کە تەوزیفکردنی ئەو ئەزموونە بەندە بە توانای خەیاڵ و دەسەلآتی زمانەوە. کێشەی گەورە لەناو ئەم واقیعە نوێیەدا پێوەندیی نێوان بینین و وێنەیە. لەناو هەموو واقیعەکانی پێشوودا وێنەکان کەم و زۆر جێگیر و بەشێک بوون لە مرۆڤ خۆی، بەلآم لەم سەردەمە ئیلیکترۆنییەکەدا وێنەکان خێرا و بگۆڕن، بەتەواوی لە دەرەوەی مرۆڤدان. رووکەشن و دوورن لە قووڵی، چونکە پابەندی پرۆسێسی سوودن و کار لەسەر تەممەڵکردنی خەیاڵ و ئەقڵ دەکەن. پێشتر لە گفتوگۆیەکدا گوتوومە، کە لەم سەردەمە ئێلیکترۆنییەکەدا وێنەکان رۆڵی دووفاقیانە دەبینن، لەلایەک کار لەسەر روونکردنەوەی واقیع دەکەن، بەوەی زۆر بەئاسانی و

میکانیکییانــه ئــەو زۆنــە نەزانراوانــە چ لــەناو خــەیاڵ و چ لــەناو واقیعــدا کەشــف دەکـەن، کـە دەبوایـە نووسـەر لـە ڕێگـای زمـان و خـەیاڵی خۆیـەوە پێیـان بگـات و لـە لایــەکی دیکــە نووســەر دەخەنــە بــەردەم پــەلاو (تحــدی Challenge)ی گــەورەترەوە، بــەوەی دەبێــت تێکــڕای ئــەو وێنانــە تێپــەڕێنێت و وێنــەی گــەورەتر بەرهــەم بهێنێـت. هـەموو ئەمانـە کـار لەسـەر خێرایـی کـات دەکـەن، کـە مـن پێشـتریش گوتوومــە خێرایــی ئــەم ســەردەمــە چەنــدین جــار لــە خێرایــی ســەردەمەکانی پێشــوو زیـاترە. دیـارە ئـەو خێراییـەش لـەژێر کاریگـەریی کۆنتێکسـتی کۆمەڵایـەتی دایـە. وەکـو (نۆئــام چۆمســکی) بــاوەڕی وایــە (کــات)یش بەشــێکە لــەو واقیعــەی، کــە زمــان دەیگوازێتەوە. لێرەوەیە شەڕی ئەم نەوەیە، شەڕێکە لەگەڵ تارماییدا.

# ڕاپۆرتێک لە کوشتاندینا

لەو نامە ساختەیەدا کە ژیانی ڕاستەقینەی نالی دەگێڕێتەوە؛ بەو جۆرەی کە لە (ئیستامبووڵ) عاشقی کەنیزەیەک دەبێ کە عوسمانییەکان لە شەڕی ڕۆمدا گرتویانە و ئێستا وەک ئیشکەرێک لە قەڵای سێی چێشت لێنەران؛ تاقی حەوت، کار دەکات.. لە هامشۆی نێوان نالی و شاعیرانی فارسا بۆ دیوان، لە بەرەوژوورکەکەی (لالەلی) چاویان بەیەک دەکەوێ و نالی دڵنیا دەبێ کە ئەمە حەبیبەی ڕاستەقینەی خۆیەتی و بەخێراییش ئەوە بەسەریا دێت کە ئینسان هەمیشە یەکەم و دووەمی شتەکانی لێ تێک دەچێت.. لەو دەستنووسە تورکییەدا کە بەختی شکستەی فارسی نوسراوە و ئێستا وا لە (مۆزەی ئەسفەهان) و من بەسەریدا دانەویومەتەوە و لە هێڵی چەماوە و کەوانەیی و لاری نێوان پیتە کاڵەوبووەکانیدا ڕاماوم و بەئەستەم خەریکم شەرحەکەی لە حاشییەدا دەخوێنمەوە؛ باس لەو عەشقە سەخت و توندەی نالی دەکات بۆ کەنیزەکە و هاتووە کە؛ شەوێکی درەنگ نالی و کچەی ڕۆمی دەستی یەک دەگرن و بۆ هەتاهەتایە کۆشکی سوڵتان جێ دەهێڵن و لە دەریای (مەڕمەڕە)وە بۆ جێیەکی نادیار ون دەبن.

ئەگەر (قیرغیزییەکــان) ئەمشــەو لە مۆســکۆ ئەو چــالاکییە ترۆریســتییەیان نەکردبــایە.. مــن دەرگــای ئەم بــاوەڵەم لەم ســەردابە شــێدار و ترســناکەدا جــارێکی تــر نەدەکــردەوە.. مــن لە دڵەوە لەگەڵ خەڵکــی ڕوســیا هــاوغەمم. ئەوەی کە ڕووداوەکــان دەتــوانن ڕووداوی تــر بەدوای خۆیانــدا بێــنن بــۆ مــن شــتێکی نــوێ نەبــوو، بەڵام ئەوەی کە ڕووداوێــک توانــای ونکردنــی ڕووداوێکــی تــری هەیە، ئەوە یەک لەو وانە نوێیــانە بــوو کە مــن لە ئەنجــامی تێڕامان لە کوشتن و وێرانکردنەوە پێی گەیشتم.

کــابرایەکی قاجــاری شــاعیری دیــوانی ســوڵتان نوســیویە: "ئەمێســتا مــن لە کــونجی حەپســخانەوە ئەم پەیغــامە ســەجلدەکەم و ســبحەی ســوبح لەگەڵ نــوێژی فەجــرا بەقەتلــی مــن و دفــنم لە جەزیــرەی (ئۆســکەدار) لیــل ئەبەد ئەم فەهێــت و عەیــبە میســلی لەکەیەک، لە خۆیــان مەســح دەکەن و مــن لە نــــائیبی نــــالییەوە فەوت دەکەم". هەرچــــی ســــەبارەت بە نــــالی یەکەم و ڕاستەقینەشــە، (خــزرڵلای شــوعاعی قاجــاری) نوســیویەتی "نــالی لە هــیچ مەکــــانێ چــــاونەکراوە و تــــا یــــومی قیــــامە مەنفیــــیە دەســــت بەیەدی مەعشوقەیەوە".

لە مۆزەخــــانەی (ســــوور) لە (مۆســــکۆ) شــــەقامی (لێۆفســــکی) باڵەخــــانەی ٢١٦ نهــۆمی ژێــرزەمین، کچێکــی کــاڵ لەوانەی برژانــگ و پێســت و کەزێیــان بەدەرەجەیەکە دڵــی بونیــام سســت دەکــا، لەپشــت مێزێکــی ئاســنی کــۆنەوە، بە زەردەخەنەی کارمەنــدێکەوە کە پیشــەییانە دەیەوێ دڵــی میوانەکــانی ڕابگــرێ، پێشــوازی لــێ کــردم. بەڕوســییەکی شــکاوی تــێکەڵ لە ئینگلیــزی، خــۆم ناســاند و وتــم بەڵگەنــامە هەواڵگرییەکــانی کۆتــای ســەدەی نــۆزدەم دەوێ ســــەبارەت بە دەوڵەتــــی عوســــمانی لە ویلایەتــــی ئیســــتامبووڵ، بــــۆ ســاتێک بــرۆی هێنــایەیەک، دیــاربوو عەیــامێکی درێــژ بــوو کەس لە بەشــێکی ئــاوا پرســیاری نەکــرد بــوو، دوایــی وەک ئەوەی شــتێکی بیــر کەوتبێــتەوە برۆکانی هاویشتە ئاسمان و سەرێکی بادا و گووتی:

- چاکی ماڵکۆ.. " کەمێک بووەستە"

- دا ئز چاکم... " بەڵێ وەستاوم"

ئەو لەناو ڕەفە دێرین و درێژەکاندا و من لە بیری ئەم دەستنووسەدا ونبووم کە ئێستا وا لە باخەڵی چەپمدا و نەمدازانی تا ئەمڕۆ، ئاوا سیحریانە و مینا سێبەرێک ژیانی من بەدوای خۆیدا کێش دەکات..

باشچاوشێکی مەلول و ژولیدە لە حەپسخانەی تایبەتی سوڵتانەوە کە دەکەوێتە پشت یەکێک لە ئەمبارە گەورەکانی گەنمەوە لە خوارووی (باغچەلی)یەوە کە ئەوسا پێیان دەگووت (بیئۆغلۆ)، سەعات سێ و چواردە دەقیقە بە کاتی عەرەبی نامەکە لە نالی وەردەگرێ و بێ بەرامبەر وەک هەر سەرکێشییەک کە بەسەر هەریەکەماندا دێ و لەوە دەچێ نرخەکەشی بەژیانی خۆمان تەواوببێ، نامەکە دەگەێنێتە سەر سنوری خاکی عارەبان.. باشچاوش بەدنیابینی خۆی و لەپێناو گەیاندنی نامەکە بەجێی مەبەست، ڕاستەوخۆ بۆ ئێرانی نانێرێ، بەڵکو بە تەکنیکێکی سەربازیی کە ئەفسەرێکیساڵخوردە دایڕشتبێ بڕیار دەدات ڕێگەیەکی دوورو تووڵانی (بەڵام سەلامەت)ی پێ ببڕێ.. بەمجۆرە لە دووی ڕەبیعی یەکەمی ١٢٩٣ی کۆچی دا و پاش سێ مانگ و یانزە ڕۆژ لە ماندنی نالی دووەم، بەڕێگای (شام)دا نامەکە دەگەێنێتە سەرسنوری (میسر).. بەپیازی زەردی کۆنە دەفتەر لازم بە هەژدە شەوی تر ئینتیزار دەکات تا دەگاتە دەست (پەروێزی ئەکبەریی)، عالی جەنابی نوێنەرایەتی شای قاجار لە میسر..

کە لیستی ناوی بەڵگەنامەکانی بۆ هێنام، بە هەردوو زمانی ڕوسی و ئینگلیزی لە خشتەیەکی سێ ستوونیدا ناوی ڕاپۆرت و ڕاپۆرتنووسەکەی و مێژووی ناردنەکانیانی تێدا تۆمار کرابوو. بەوەدا من ناوی ڕاپۆرت نووسەکەم نەدەزانی و لەو مێژووەشدا کە بەرامبەرە بە ١٧٨٦ی زاینی، چوون ئیمپراتۆریەتی عوسمانی وەک قەڵتاغێک لەسەر تەختەڕەقێک گیانی دەدا، قەڵەمڕەوەکەی تژی ببوو لە جاسوس و خەبەرلەر و

ئەوبیانیـــانەی هەواڵگریـــانە کاریـــان بـــۆ بەرژەوەنـــدی وڵاتەکـــانی دراوســـێ دەکرد..

ئەمە دیســـان دۆزینـــەوەی نـــامەی مەبەســـتی لەو مێـــژووەدا بـــۆ مـــن دژوارتـــر دەکـــرد، ناچـــار بەنـــاوی ڕاپۆرتەکانـــدا ڕۆیشـــتم تـــا گەیشـــتمە ســـەر ئەم ناونیشـــانە: (ڕاپـــۆرت- دەقـــی نـــامەی نـــالی، شـــاعیری فـــارس. لە کوشـــتاندینا ٣-٤-١٧٨٦) زانـــیم ئەوە ئەوشـــتەیە کە مـــن بەدوایـــدا دەگەڕێـــم، گـــوتم ئەم نـــامەیەم دەوێ.. ئەو ســـەیری دەکـــردم و مـــن هێکـــڕا هێکـــڕا دەمگـــووت ئەم نامەیەم دەوێ.. ئەم نامەیە.

ئاغـــای (ئەکبەریـــی) شـــابەندەری ئێـــران، نـــامەکە وەک گەوهەرێـــک دەبینـــێ و مەراقـــی ئەوەی نە خـــۆی تـــورکی دەزانـــێ و نە کەســـە نزیکەکانیشـــی و لە ترســـی ئەوەی نەبـــادا نهێنییـــەکە درزە بکـــات و بگـــاتەوە بە تورکـــان، لە کەس ڕانـــابینێ بـــۆ وەرگێرانـــی نـــامەکە بانگهێشـــتی بکـــات.. هەر زوو بە قاســـیدێکدا ڕەوانەی شـــای دەکـــات لە (تەبرێـــز).. دوای ســـێ شـــەو لە دەرچـــوونی نـــامەکە لە میســـر، شـــابەندەری ئێـــران لەوپەڕی ســـەلامەتیدا و لە کەیـــف و ســـەفای ســـەر (نیـــل)دا بەدیـــار ئەو خـــانمە ئەســـمەرانەی هـــیچ شـــتێک لە دنیـــا نـــازانن جـــگە لە ســـمتبادان و وا ئەو هـــونەرە گەورەیەشـــیان نیشـــانی پەروێـــز دەدەن، شەوێک دڵی بەهێزی دەوەستێ و دەمرێ..

ئەو ڕۆژانەی ئەمـــــانە ڕوو دەدەن تـــــورکی باشـــــچاوش لەو کـــــارەی زۆر پەشـــــیمان دەبـــێ و هەســـتی خیـــانەت لە دیـــن و ئەرک و هاودینەکـــانی ڕایدەکێشـــێتە ســـوچی گۆشـــەگیری و جـــگە لە گریـــان و ســـوجدە بـــردن، ســـوکنایی بە هـــیچ نـــایەت.. تـــا ســـەعات چـــوار و ســـی و یەک دەقـــیقەی عەســـرێک لە مزگەوتـــی (قەدی بایەزیـــد) پیاوچـــاکێکی ڕێبـــوار پێشـــنیاری پـــێ دەکـــات کە "بونیـــامی زەعیـــف بـــۆ تەســـکینی ڕۆحـــی عاســـیی، هـــیچ لەوە بـــۆی دەرمـــانتر نییـــە قســـەی دڵـــی خـــۆی بکـــات و دان بەگوناهیـــدا بنـــێ".. پـــاش قەیـــرێ، بێســـرەوتی ئـــێمە لەســـەر دەســـتی ئەم خواناســـە دان بەتاوانەکەیـــدا

دەنێ و هەمان شەوی ئەو عەسرە ئەم چاوشە کەسیرەیە لە ڕووداوێکی تەمومژاویدا لە ماڵەکەی خۆیدا بە چەقۆ دەکوژرێ.

شەوهایەکی زۆر من شەرابم خواردەوە و لە پیتی پێچەوانە و سەرهەڵگەڕاوی ئەم نامەیە ڕامام.. ڕۆژگارێکی درێژیش لە بەرامبەر فەرهەنگە قەبەکانی زمانی ڕوسیی دا دانیشتم و هەوڵی وەرگێڕانی ئەم نامەیەمدا کە دەتوانێ بەشێکی گەورەی نهێنی هەڵهاتنەکانی (نالی)مان بۆ ئاشکرا بکات.. ئەوەی لەو وەرگێڕانە حەرفیانەدا پێی گەیشتم، ئەنجامێکی دڵ خۆشکەر نەبوو جگە لەوەی دواجار حاڵی بووم کە ئەم نامەیە لە نالییەوە بۆ ژنێک نوسراوە.

ئێستا کە دووسەد و سی و چوار ساڵ بەسەر ئەم ڕووداوانەدا تێ دەپەڕێت و من لە نێوان ئێران و ڕوس و تورانا بەدوای بەشی جێماوی ئەم چیرۆکەدا دەگەڕێم، هیچ سەرەداوێکم لەسەر ناوی ئەو پیاوچاکە دەست نەکەوتووە.. ئەوەندەی دەیزانم بەپێی فەرمانێکی ڕەسمیی سوڵتان، دەفتەرداری دەروازەکانی (قوستەنتینە)و سەرجەمی تەکیە و خانەقاکانی، دەبێت ناوی هەموو میوانێکی بیانی لای خۆیان تۆمار بکەن.. بەڵام ئەو ڕۆژانەی ئەم یەکتر بینینەی باشچاوش و خواناسە نەناسراوەکەی تێدا ڕوودەدات سوڵتان لە حەج دەبێ و بەم جۆرەش هیچ میوانێکی تایبەت ڕوو لەدیوان ناکات.. دوای سۆراغێکی زۆر لەدەفتەری هۆتێل (قاغێ) لە دامێنی (ئەیاسۆفیا)، بینیم لە تەنیشت ناوێکەوە کە کوژاوەتەوە و ناخوێنرێتەوە، بێ گرنگی پێدان و تەنها وەک تێبینییەک نوسراوە "ئەم ئەغیارە موساییە".

چەند ڕۆژێک دواتر سوڵتان ڕێوڕەسمی حەج لە قەلەقییەکی زۆر و خێرایییەکی چاوەڕوان نەکراودا تەواو دەکات و دەگەڕێتەوە ئیستامبووڵ. لەو ماوەیەدا کوژرانی پاسەوانێکی حەپسخانە نهێنییەکانی سوڵتان، وا دەکات دەوڵەت بکەوێتە خۆی و لە هەموو سنوری قەڵمڕەوی لەگەڵ خاکی فارس و ڕوس و ڕۆمدا بکات بەخەبەرلەر و سیخوڕ و چاو و گوێ..

(ناسـرەدین سـالاردەوله) له کتێبه مێژووییەکەیدا؛ (هەڵهاتن له گـورگەزێ) بەدرێژیی وەسفی ئەو شەڕە خوێناوییە دەکات کە لە کوتایی سەفەرەکەیاندا، ئێوارەیەکی پایز لە نێوان پەیک و دەستەی پارێزگارییەکەی لەگەڵ چەند فەسیلێک لەچەکدارانی پیادەی عوسمانی لە بۆسەیەکدا لەخواروی (دیوانییە) ڕوودەدات و تێیدا هەشتا کەس لە پیادەکانی عوسمان دەکوژرێن و چوار تفەنگ بەدەستیش لە خێڵی قاسید "ڕۆحی بەرزیان بە ئێوە عەتا دەفەرموون" وەک سالاردەوله لە وەسفە شیعرییەکەیدا نوسیویەتی " ..ئەو غروبە هەوری چڵکنی پایز.. نم نم لە جێی باران خوێن دەبارێنێ".

سەفەری دووری من و وێڵیم بەشارانەوە وای کرد بیرۆکەی گەڕانەوە و ساغکردنەوەی ئەم نامەیە بێنمەوە بۆ وڵات و ئەم گرێ قورسەی سەر دڵم لەلای جەنابی پرۆفیسۆر بکەمەوە؛ ئەوشەوەی بە تەلەفۆن قسەمان کرد و دوای خۆناساندنێکی کورتی من و ڕوونکردنەوەیەکی سەرپێیی مەبەستەکەم، لەو دیو هێڵی تەلەفۆنەوە لەناو غەڵبەغەڵبێ میوانەکانیدا بەزارێکی شیرینەوە گوتی "سبەینێ لە هۆڵی کتێبخانەی زانکۆی سلێمانی یەک دەبینین و نامەکە وەردەگێڕین" سەعات هەشتی بەیانی ڕۆژی دواتر تاقە ڕۆژنامەی ڕۆژانەی شار بە خەتێکی درشت ئەمەی لە مانشێتیدا نوسیبوو: ((ئەمشەو لە کارەساتێکی ئۆتومبێلدا پرۆفیسۆر (عەبدولڕەحمانی حاجی مارف) گیانی سپارد)) ئیتر من زانیم ئەم نامەیەی لای من، شتێک لە تەلیسم و شتێک لە نەفرەتی لە خۆیدا هەڵ گرتووە.. هەر ئەم ترسەش وای کرد من سێ ساڵی تر نامەکە لە باوەڵێکی کۆندا بپارێزم و نەچمەوە سەری.

(میرزا جەلالی مەمالیک) میرزای (حیسامەدینلملکی کوڕی فاتح عەلی شای قاجار) لە یاداشتەکانیدا دەڵێت عەسرێکی درەنگ پەیک گەیشتۆتە تەبرێز و لەخانی بەردەم کۆشکدا و بەرلەوەی بەخزمەتی شا شەرەفیاب ببێ، لە پەلەپەلێکدا لە ئەسپەکەی کەوتۆتە خوارێ و

بەرلەوەی فریــای خەڵات و بەراتــی شــا بــکەوێ مــردووە.. میــرزا مەمالیــک نوســیویەتی "لە دیــوان شــا بەدەســتی موبــارەکی خــۆی مــۆری ســەر زەرفەکەی شــکاند و فەرمــووی جەلال بخــوێنە، پەیغــامەکەم لە دەســتی موبــارەکی وەرگــرت و روانــیم وەک پیرێکــی ســاڵخوردە نــامەکە گیــان دەدا، بەنــی ئــادەم وەهــای ئیحســاس دەکــرد ئەگەر ئێســتا فریــای خۆنــدنەوەی نەکەوێ حیبــری تــاڵ و تــاری چــوون ڕۆحێکــی پەژمــووردە، لە بەیــازەکە هیجــر دەکــا و ئەچــێ بــۆ ئاســمان.." میــرزا جەلال دوای وەســفێکی زیــادە و پێــوەنراوی ســاتی وەرگرتنــی نــامەکە کە هەژدە لاپەڕەی یاداشــتەکانی پــێ ڕەشــکردۆتەوە دەڵــی ئەم بەیــتە شــیعرە ســەر دێــرێ نــامەکە بــووە: "نفس ساعت گیپــی ایشرســە گــر یــاد ایلــە تاعتــدر؟ بــر انــک قورمەســی پیریولــونە احیــا ســاعتدر" کە لە مــوزەکەراتی مەمالیــک دا گەیشــتمە ئێــرا، ئێســتێکم کــرد و چــوومەوە ســەر دیــوانی نــالی چــاپی ١٩٢٣ی (عەلــی موقەبیــل)، هەمــوو دیــوانەکەم شــەنوکەو کــرد، ئەم بەیــتەم تیــا نەدی. دواتــر لە چــاپی ١٩٧٩ی (مەلاعەبــدولکەریمی مــودەڕیس)دا دیــتم خــۆیەتی هەمــان بەیــتە و لە پەراوێزیــــدا ئامــــاژەی داوە کە لە نوســــخەی دەستنووســــی (حــــاجی ئەحــمەدی تــوربەیی) نــاوێکەوە وەریگرتــووە.. ئەو زەمــانە (مەلا شــکور)یان وەک تــورکیزانێکی بلــیمەت تەکلیــف کــرد بــوو بــۆ لێکــدانەوەی بەیــتەکە، بەڵام بەداخەوە مەلا شــکور بــۆ ئەوە نــاچێ کە ئەم بەیــتە تاقــانەیە هــی نــالی نیــیە و چــوون لە زیندانیشــەوە نوســراوە و لەترســی بەردەســت کەوتــن و ئاشــکرا بــوونی، نوســەرەکەی هێنــدە فامیــدەبووە کە بزانــی پیتەکــانی بەیــتەکە و تەواوی نــامەکەش بە پــێچەوانەوە و لە چەپەوە بــۆ ڕاســت بنوســێ و بەمجــۆرەیش بــۆ پەی پێبــردن و تێگەیشــتنی جــگە لە خوێنــدنەوەی لە ئــاوێنەدا، هەر هەوڵێکــی تــر بــۆ ســەر لــێ دەرکردنــی ســەر لێ تێکچوونە.

هەر ئەمــڕۆژانە چــاوە کەمتینەکــانی عوســمانی توانــای دیتــنەوەی ئەغیــارە جووەکەیــان دەبــێ و پــاش ئەشــکەنجەیەکی زۆری کە ســوکترینیان ئەوە

دەبێ بەخەنجەر پوزی قاژ بکەن و پڕی بکەن لە خوێ و توند شەکەتی دەن، سەحەری ڕۆژی دووشەممەی ٢-٥-١٧٨٦ داندەنێ بەوەی سیخوڕی ڕوسە و ئەوەش ئاشکرا دەکات کە دەقی ئەسڵی نامەکەی لە باشچاوشێک وەرگرتووە و وەریگێڕاوە و ناردوویەتی بۆ (پیترسپۆرگ)..
(من لێرەدا ئەوەم بۆ ڕوون بووەوە کە ئەو نامەیەی بۆ ئێران چووە، جگە لە نوسخەیەکی لەبەر نوسراوەی نامە ڕاستەقینەکە بەدەستکارییەوە هیچی تر نەبووە..) دوای ئەم دانپێدانانە سەعات دە و چل و سێ دەقیقەی بەیانی بەکاتی عەرەبی لە مەیدانی (تۆپخانە) بە بەرچاوی دانیشتوانی ئیستامبووڵەوە سیخوڕەکە بە شمشێر دەکرێت بە دوو لەتەوە.

ئەمشەو کە لە هەواڵەکاندا پەلامارێکی تڕۆریستیی کەمینە قیرغیزییەکانم بۆسەر مۆزەخانە سوور لە مۆسکۆ دی، تەنیا من زانیم ئێمە کلیلێکمان تێیدا فەوتا کە دەتوانێ کۆدی ون بوونی نالی بکاتەوە.. سوتاندنی مۆزەخانەکە وای کرد من جارێکی کە سەری باوەڵەکەم بکەمەوە.. بۆ تێگەیشتنیش لەو نهێنیە گەورەیە جگە لە (مامۆستای خەزنەدار) کە لەشارێکی ١٥٠ کیلۆمەتری تەنیشت شارەکەی منەوە دەژی، من کەسی دیکەم پێ شک نایە.. ئێستا کە من ئەو چیرۆکەم بۆ ئێوە دەنووسییەوە کاغەزێکی زەرد وا لەباخەڵی چەپم دا و بەڕێگاوەم بۆ ئەو شارە، ئومێد دەکەم تا من دەیگەمێ مامۆستا سەلامەت بێ.. کێ دەزانێ چیرۆکێکی تر لە ناو نامەکەدا چاوەڕێی ئێمە ناکات..!

٢٠١٠

**کوشتاندینا: ناوی دووەمی شاری قوستەنتینە-ئەستەمبووڵە، بەزمانی عیبریی.**

# کچی ناو تابلۆکە

کە جێی هێشتم لە بەیانییەکی ساردی ناو چوار دیواردا، بێ باک پێی وتم: "ئەوا من ڕۆیشتم.. تۆش هەوڵ بدە بەرگەی ئەم ئازارە بگریت." هیچی تری نەوت، ئەو قسەیەی تەواو لە ئامۆژگاریی ئەو جەلادە دەچوو، دوای ئەوەی گوللەیەکی ناوەتە کەللەی قوربانیەکەیەوە، دەست بنێتە ژێر سەری و بە سۆزەوە پێی بڵێت: "هاوڕێ، هەوڵ بدە بەرگەی ئەم ئازارە بگریت." ڕۆیشت.. خۆی و تیسکۆت و پرگال و ڕاستەکانی ئەو بەیانییە ڕۆیشتن و نەمبینینەوە.

من نازانم ئەو ژنەم چۆن ناسیووە؟ یان بیرم چۆتەوە، یان نامەوێت وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە.. نازانم؟ وەلێ دڵنیام لەسەر داوای ئەو هەر لە بەیانییەکدا بووینە ژن و مێرد. ماڵەکەمان تەنها یەک قاتی شێوە لاتەریب بوو، دەرگاکەمان لەسەر ڕووی ستوونی بە دوو بەش دەکرایەوە، پێنج ژوورمان هەبوو، پەنجەرەی ژووری چێشتخانە حەوت تەبەق بوو.

هەر جارێک لە چاوەڕوانیی پێگەیشتنی خواردنێک، یان لە هێنانی پەرداخێکدا، یان لە شۆردنی چەقۆیەکدا لەوێ بمایەتەوە، خێرا دەکەوتە دابەشکردنی پەنجەرەکە، جارێک بەسەر یەک و جارێک بەسەر سێ و جارێک بەسەر خۆیدا.. ڕۆژێک لە هێنانی کەوچکێکدا، چەند سەعاتێکی پێ چوو. وەختێک هاتەوە، من دەمێک بوو خواردنەکەم تەواو کردبوو.. هێندە پەست بوو، کاکیلەکانی دەرتۆقی بوون، ناوچەوانی گرژو

چاوەکانی بچووک ببوونەوە، پێی وتم دەبێت پەنجەرەکە بگۆڕم: "ژمارە حەوت لە ژمارەناسیدا، ژمارەیەکی ڕۆمانسییە.. من نامەوێت خەیاڵ لەم ماڵەدا هەبێت."

چەند جارێکی زۆر کەم نەبێت، من هێندە لەو تابلۆیەم نەڕوانی بوو، کە لەپشت تەلەفزیۆنەکەی ژووری میوانەوە هەڵیواسی بوو؛ پۆرترێتی خەیاڵیی کچێکی سپیکەلە، کە کەمێک چاوی ڕاستی لە چاوی چەپی بچووک تر بوو، لوتێکی قنج و ڕێک و لێوێکی گۆشتنی تەڕ بە چەناگەیەکی نەرمەوە، ئەویش بۆ گەردنێکی بەفراوی شۆڕ ببووەوە، هەموو پۆرترێتەکەش ڕژابووە ناو ئێوارەی دەریایەکەوە، کە لە تەنیشتییەوە کوڕ و کچێک لە بەلەمێکدا دانیشتبوون و لەو وێنەیەیان دەڕوانی. ئەو خۆشیی لەمجۆرە تابلۆیانە نەدەویست. هۆی هەڵواسینەکەشی دەگەڕاندەوە بۆ ئەوەی کە دیاریی کوڕێکی هاوپۆلییەتی و پێکەوە بەشی ماتماتیکیان تەواو کرد بوو.

من لەو ئەو ماڵە ماتماتیکییەدا، سەرم گێژی دەخوارد، سەرچەفی سەر سیسەمی نوستنەکەمان پڕ بوو لەسێگۆشە، کە دەم دا بە خۆمدا، یەک یەک گۆشەکانیان هەڵ دەچەقینە گیانم، کەم بەیانی هەبوو، من خوێنی ئەو لوتە گۆشانە نەشۆم، کە سێگۆشەکانی شەوێ کردبوویانە گیانمەوە.

فەرشێکی ئێرانی لە هۆڵەکەدا ڕاخرا بوو، وێنەی هێڵێکی ڕاستی تیابوو، کە دەتوت وەستایەکی قاجاریی بەدیلگیراو، لە داخدا ئەو هێڵە بێ ئیشەی وا ڕاست کێشابوو. ئەو بەردەوام دەیوت: "دەبێت ئاگامان لەو ڕاستە هێڵە بێت، پێی پیانەنێین، نەکا خوار ببێت." منیش قاقا پێدەکەنیم و دەموت: "مەترسە.. کوا پێی من ڕاستە هێڵی ئەم ماڵەی بۆ خوار دەکرێت؟"

من ئێستاش قێزم لە سێکس دێتەوە، شەرم دەکەم کە دەڵێم تەنانەت جووڵەی سێکسییشمان بە ژمارە و تەکنیکییشمان بە هێما بوو.. لە گەرمەی سێکسەکاندا پێی دەوتم: "ئەها ژمارەکان چەند لێمانەوە نزیکن،

بـڕوانە ئێسـتا مـن و تـۆ چەنـد لە یەکگرتنـی دوو ژمـارەی نـاو کـۆمەڵەیەک دەچـین." ڕاسـتییەکەی مـن و ئەو لەو حـاڵەدا، لە یەکتربڕینـی دوو ژمـارەی سەر بە دوو کۆمەڵەی زۆر جیاواز دەچووین.

کاشـییەکانی حەوشـەکەمان، ڕێـک بە وەرەقەی خەت بەیـانیی دەچـوو، بەیانییەکیـان مـن لە سـەربان بـووم، ئەو لە خـوارەوە سـەرقاڵی شـۆردنی حەوشـەکە بـوو، مـن بینـیم لەپـڕ ماسـیحەکەی دەسـتی فڕێـدا و سـۆندەکەش بەسـەریدا، ڕێـکەوت بە شـێوەی (کـۆ) کەوتـنە سـەر یەکتـر، مـن لە سـەرەوە لەو وێـنە هـیچەم دەڕوانـی و ئەو لە خـوارەوە شاگەشـکە ببـوو، دەیـوت: "هەموو شتێک لەم ماڵەدا، بیرکارییە و تەنها ڕژێمیش، ڕژێمی پۆتانە."

ئێسـتا هەسـت دەکەم وردە وردە خۆشەویسـتیم دەچێـتە سـەر تـابلۆکە. ئەویـش گومـان لە هەمـوو شـتێک دەکـات.. کەمتـر لە جـاران ڕێـگەم دەدات بچـمە ژووری میـوان.. مـن هێشـتا ئەو پرسـیارەم لە خـۆم نەکـردووە: مـن بـۆ ئەوەنـدە پیـاوێکی بـاغە بـووم، کە ئەو بە ویسـتی خـۆی دەیجووڵانـدم؟ نازانم!

مـاوەیەک کتێبـی هـاوڕێیەکیم لەلابـوو، باسـی لە پەیوەنـدیی نێـوان بیرکـاری و فەلسـەفە دەکـرد، بەزەحـمەت چەنـد لاپەڕەیەکـیم خوێنـدەوە، ڕقـم لەو کتێـبەش بـوو، دوایـی تێگەیشـتم لەوانەیە بیرکـردنەوە لە ژیـانیش، وەکـو بیرکردنەوە لەو ماتماتیکە هیچە وابێت، کە ژنەکەی من عاشقیەتی.

خـــودایە چ کـــائینێکی ســـەیر بـــوو ئەو ژنە! یەک بەیەک کاســـێتی مۆسـیقاکانی شـۆپان-ی شـکاندم، پێـی وتـم: "شـەوانە بـۆ ئەوەی بچیـتە خەوێکـی قـووڵ و ئـارامەوە، پێویسـتە هاوکێشـەیەک شـیکار بکەیـت." ئەو خـۆی هەمـوو شـەوێک وای دەکـرد. مـن ڕۆژێـک لە ڕۆژان نـارەزاییم لەو حـاڵە دەرنەبـڕی، هەرگیـز پـێم نەوت مـن ڕقـم لە بیرکـارییە. ئەگەر بەئەمـانەتەوە شـتەکان بگێـڕمەوە، دەبێـت ئەوە بڵـێم، بە هەمـوو ئەو سەرئێشـانەی بـۆی دروسـتکرد بـووم، هێشـتا مـن ژنەکەی خـۆمم خـۆش دەویسـت.. لـێ ئەو بـــاوەڕی بە خۆشەویســـتی نەدەهێنـــا، هەر لە یەکەم ســـاتی

یەکترناسینمانەوە پێی وتم: "ئێمە پێویستمان بە یەکتر هەیە." من لەنێوان عەشق و پێویستیدا پەرت و ون ببووم. دەیوت: "من دراوم و تۆ داواکراو.. بۆ ئەوەی ئەم پرسیارە گەردوونییە تەواو بکەین، ئێمە زۆرمان پێویست بە یەکترە."

ژیانی ئەو جارێکی تر ڕۆژێکی ڕەشی وەک ئەو ڕۆژەی تێ نایەتەوە، کە ژن و مێردێکی هاوڕێم بۆ نانخواردن بانگهێشت کرد بوو.. وەختێک پیاوە چووە سەر دەستشۆرەکە و لەبری ئاوێنە، بازنەیەکی خاڵیی بینی، هاواری کرد: "ئەرێ ئەمە ماڵی ئەنیشتاینە یان قوتابخانەکەی فیساگۆرس؟" ژنەکەم خۆی خواردەوە، دەمزانی هەر کاتێکی تر بێت، ئەمە بە من دەڕێژێت، هیچی نەوت.. ژنی هاوڕێکەم سکی پڕبوو، داوایان لە ئێمە کرد ناوێک بۆ ئەو منداڵەیان پێشنیار بکەین، کە بەنیازن لە سەرەتای ئەم پایزەدا لەدایک ببێت.. من وتم ناوی بنێن (ڕامان)، ڕووی دەمیان کردە ژنەکەم، ئەویش چاوی لەسەر خوێدانە لوولەییەکەی سەر سفرەکە قەتیس کردو وتی "ئەگەر کچ بوو..." ئەو ڕۆژێک لە ڕۆژان مێینەیی خۆی لەبیر نەدەچوووەوە، بۆیە ئەگەرێکیشی خستە ناو قسەکانی تا پێمان بڵێت جیاواز لەم ئەگەرە، ئەگەرێکی تر هەیە، کە ئەگەری کوڕ یان ئەگەری کۆمەڵەی فایە، من دەمزانی ئێستا ئەم ڕستانە بەناو زەینیدا دێن و دەچن.. سەری هەڵ بڕی و وتی: "ئەگەر کچ بوو ناوی بنێن (س)..."

نەیانهێشت تەواوی بکات، کەوتنە پێکەنین، پیاوەکە بە لاقرتێیەکەوە وتی: "ئەگەر کوڕ بوو ناوی دەنێین (×)" ژنەکەم بەمە دەهەری بوو، وەخت بوو هەردوو ڕەشێنەی چاوی لە کالانە بترازێت و بێتە دەرێ. زانیم تازە هاوسەنگیی مێزەکە تێک چوو، ئەوەش من نیم ئەوەندە کارابم، بتوانم ئەو هاوسەنگییە بهێنمەوە. ئەو هەستا و قیژاندی، مێز و کورسییەکان لەرینەوە، پەردەکانی گوێم تەقڵی ئەو لەرینەوەیە ببوون، پێیوتن: "ئێوە بەم داواکراوە سەلمانتان کە بێ ئەدەبترین میوانن، خێرا

لەنــاو ئەم کەوانەیە بــڕۆنە دەرەوە." ئەو وەختێــک کە دوو وشــەی کۆتــایی دەوت، ئاماژەی بۆدەرگای حەوشەکە دەکرد.

تــابلۆکەم زۆر خــۆش دەویێــت.. ئەویــش ئەمەی بــاش دەزانــی. خۆشەویســتیم بــۆ تــابلۆکە وەک ئەو دەیــوت: "لەوانەیە هاوســەنگیی مــاڵەکە تێــک بــدات." ڕاستییەکەشــــی تێکـــی دا.. شـــەوی ڕووداوەکە، ئەو زۆر مانـــدوو بـــوو، تەنــانەت بیــری چــوو مــاچی پــێش نوستنیشــم بکــات، لە تەنیشــتمەوە خەوی لــێ کەوت. بە تــیلەی چــاو ســەیرم کــرد، لەژێــر ڕوونــاکیی کــزی گڵــۆپە ســەوزەکەدا، بە ژمــارە (یەک) دەچــوو، درێــژ بووبێــت.. مــن خەوم لــێ نە دەکەوت، لەوانەیە عەشــقی تــابلۆکە نەیهێشــتبێت چــاوم بچێــتە خەو. ئــای کە بیـــرم لەو تـــابلۆیە دەکـــردەوە، گـــوێم لەهەنســـکێک بـــوو، کچێـــک بەعەزرەتەوە هەڵــی دەدا. پەتــی خەیــاڵی پچڕانــدم، دەنــگەکە واقیعــی بــوو، لە ژووری میـــوانەوە دەچـــووە ســـەر هـــۆڵەکە و لە دەرگـــای ئەمـــدیویەوە بەدزییەوە خۆی دەکرد بەژێر دەرگای ژوورەکەی ئێمەدا.

ورتەم لە خــۆم بــڕی، چــون مامزێــک کە چــاوی بە شــکارەکەی دەکەوێــت و ســرتە لە خــۆی دەبڕێــت، ئــاوا بێــدەنگ بە تاســانێک تــێکەڵ بە حەپەســان و حەجمیــنەوە خــۆم ڕاگــرت. دەنــگەکە زیــاتر و بەکــوڵ تــر بــوو، بــوو بە گریــان.. ئەو ئاگــای لە هــیچ نەبــوو، گریــانەکە خــوڕ تــر بــوو، لە جــێگەکەم هــاتمە دەرەوە و بەدەم دەنگــی گریــانەکەوە ڕۆیشــتم، خــۆم لەو زەمهەریــرەی ژووری میواندا بۆ نە دەبینرا.

لەو کــاتەوەی دەرگــای ژوورەکەم کردبــووەوە، گریــانەکە بــێ دەنــگ ببــوو، وەک ئەوەی مەمکێکــی پــڕ لە شــیرت نــابێتە زاری ســاوایەک و ئەویــش بــۆ ســاتێک ژیــر بــوویێتەوە. گڵۆپەکــانم هەڵکــرد، چوارچێــوەی تــابلۆکە ئێجگــار تەڕ بـــوو؛ دڵــۆپ دڵــۆپ فرمێســک بەهێمنــی چوارچێوەکەیــان دەبــڕی و لە سوچێکەوە دەکەوتنە خوارێ.

دەنگـــی هەناســـەیەکی ســـارد ڕای چڵەکانـــدم، ئـــاورم دایەوە، ئەو بـــوو. دەســتێکی نــابووە ســەر کێلــونی دەرگــاکە و دەستێکیشــی بە ســەریەوە بــوو،

بەو جلــی خەوانەوە، لە فریشـــتەیەکی بێــزار دەچــوو، وتــی: "زۆر چــاکە لە بەیانییەوە یان تۆ یان ئەم تابلۆیە، یەکێکتان لەمماڵەدا دەبن."

ئەو شــەوە هیچمــان نەخەوتــین، مــن دەگریــام و ئەویــش بــێ دەنــگ. بەیــانی زوو هەمـــوو شـــتەکانی نـــابووە ئەو جانتـــا لاکێشـــەییەی کە ڕۆژی جـــل هەڵگـــرتن بـــۆم کڕیبـــوو. ڕاســـتە و سێگۆشـــە و گۆشـــە پێـــوەکەی گرتبـــوو بەدەســـتییەوە، ڕســـتە نەعلەتیـــیەکەی خـــۆی وت، ڕســـتەیەک کە ئەو بـــاش دەیزانـــی، کە بەو دوایەمـــین ڕســـتەیەی، شـــتێکی ئێجگـــاری گەورە لای مـــن جـێ دەهێڵێـت.. ڕۆیشـتن و نەمبینیـنەوە. گێـل بـووم، شـەوی دواتـر بەتەنیـا گــوێم هەڵ خســت بــوو بــۆ گریــانی تــابلۆکە، چ بــێ دەنگیــیەک ئەو مــاڵە (ماڵی ژمارەکان)ی خنکاند.

تــابلۆکە لە جــاران غەمگــین تــرە.. لە جــاران زیــاتر دەگــری، وەلــێ مــن ئەو دەنــگە نابیســتم. تــابلۆکە لەنــاو جانتــاکەی ئەودا، گریــانی ناگــاتە مــن.. مــن لەو شـــەوەوە ژمارەکـــان دەمکـــوژن، نە کەســـێک هەیە کۆیـــان بکـــاتەوە و نە تابلۆیەکیش لەو ماڵەدا هەیە، تا بەسەر یەکتردا بگرین.

٢٠٠٣

# خۆکوشتن لەسەر باڵی فلامینگۆ

گوێزانێک وا لە سەرمدا.. هەر ڕاچڵەکێم، شوێنێکی خۆم بریووە. ئەم گوێزانە خۆم دروستم کردووە.. شەوێک نەنوستوویت و بەیانی لە مێشکتدا هەڵتۆقیبێت. تا (٢٩) ساڵی ڕەبەقە من خەریکی دروستکردنی ئەم نەشتەرەم؛ بیرم کردەوە هەندێک تەلی تێڕامانی زیادەڕەوم بپچڕێنم، ئیدی ئەم گوێزانەم لە مێشکی خۆمدا دروست کرد.
کەسێک بە قادرمەکاندا سەنگین سەنگین.. تەپ تەپ.. دێتە خوارێ و من هاوڕێتمی ئەو لە خوارەوە هێواش هێواش بۆ سەرەوە دەفڕم. دەزانم دێن قفڵەکەم دەکەنەوە، یان ڕاستتر قفڵم دەکەن، ئاخر من تا ئێستا دەست و پێم نەبەسترابوو، تەنیا قفڵی ڕوو لە دیوار بووم. هەمیشە کە دێن، من خۆم بە دۆزینەوەی مانای ئەو میتافۆرەوە دەخلافێنم، کە بەڕاست ئەوان لە هاتنیاندا دەمکەنەوە، یان قفڵم دەکەن؟!
فەرمانت پێ دەدەن ڕوویان تێ بکەیت، هەردوو دەستت پێکەوە جووت دەکەن و تاڵێک نایلۆنی ڕەشی گرنجگرنجی تێهەڵدەکێشن و بە ڕاکێشانێک، دەستت قفڵ دەبێت. وەلێ خەیاڵت ڕەحەت بکە، خۆت کراویتەتەوە. ئەم کەلەپچە ئەمریکییانە، لە کەلەپچە ئاسنەکان سووک ترن، بەڵام لەوانیش مەحکەم و پێوەند ترن. بیرت دەکەوێتەوە مرۆڤ

چەنـد لە ئـامراز و هۆکـاری دەسـت بەسـەرداگرتندا کـارامە و کەمـاڵە.. لە ناخی دڵەوە قەشمەریم بەزانست دێت.

دەسـتم مرەکەبـاوی دەبێـت و بیـرم دەکەوێـتەوە ئەم چیـرۆکە هـی نوسـینەوە نیـیە، هەروەک چـۆن بە جـارێ خوێنـدنەوە لێـی تـێ ناگەیـت، بە دوو جـاریش.. کە لەسـێ جـار زیـاتریش خوێنـدتەوە، ئیتـر دەچیـتە نـاوی و ناتوانیـت بێیـتە دەرەوە، ڕەنـگە لە حـاڵ و ماڵـت بکـات، سـەرقاڵت بکـات بەخـۆیەوە، ئیشـەکەت لەدەسـت دەربهێنێـت، سـەرت لـێ بشـێوێنێت و ژیانـت تـاڵ بکـات. مـن پێشـنیار دەکەم ئەگەر تـا ئێـرە هاتوویـت، بووەسـتە و مەیخوێنەرەوە.

ئەم چیـرۆکە ژیـانی تـۆیە، ژیـانی ڕاسـتەقینەی تـۆ. ئەوانـیش لەگەڵ نووسـینەوەیدا نـین، ئەوەتـا پێتـدەڵێن: "سـەرت بـکەرەوە بە کۆشـی دایکتـدا و ئەو حیکـایەتە سـەجل مەکە، چمـا لە ڕووت هەڵـدێت ئەو خـوێنە ڕژاوانە بنووسـیتەوە؟". مـن سـەرم دەدا بە دارودیـواردا.. ئـا.. دەزانیـت چـۆن هـاتمە ئێـرە؟ لەسـەر سـیلەی کـۆلانە تەسـکەکەوە دەسـتم گـرت بە دیـوارە بەردینەکـانەوە و خـۆش خـۆش هـاتم، بـۆ نـاو ئەم چیـرۆکە هـاتم، مـن پێشـتر هەلاتبووم.

هێشـتا لەلام ڕوون نیـیە، مـن چـۆن ئەم ڕۆحە بەدەی تـرم دۆزیـیەوە، نـا.. هەر گومانیشـم هەیە بەڕاسـتی دۆزیبێـتمەوە. هەنـدێک کەس لە واقیعـدا ون دەبـن، دەبێـت لە خەیاڵـدا بۆیـان بگەڕێیـت، کەچـی مـن لە خەیاڵـدا ونبـووم و وا لەسـەر جـادە سـۆراخی خـۆم دەکەم.. بـۆنی ڕازیـیانە لە خەیـالّم دێـت، هەر وا خەریکـم لاژەلاژ ڕێ دەکەم، قـاچە درێژەکـانم لەگەڵـم نـایەن، ئەوە خۆمم بەزۆر بەشوێن خۆمدا کێشیان دەکەم.

هەمـوو جەریـانەکە لەوێـوە دەسـتی پـێ کـرد؛ کە تـۆ وێنەیەکـی فۆتـۆگرافی ڕەشوسـپیی نیوپۆسـکارتی ئەوت؛ لە کـۆنترین مقەبـای مـاڵەکەدا، لەو سـەردابە شـێدار و تـاریکەت دا، لەژێـر شووشـەی شـکاو و تـاڵی لەحـیم و گلـۆپی سـووتا و و نینـۆککەری کولـدا، دیـتەوە. تـۆزی (٢٩) سـاڵی لەسـەر

خۆی هەڵگرتبوو. کە ئاوا لێت دەڕوانی، دەتوت لە ئەرشیفی کۆنە ڕەسمچییەکی ئەم شارەوە دەرتهێناوە. ئەو چاوە زەق و لوتە درێژ و سمێڵە پڕەی، چەند لە ئێستای من دەچێت. غەریب..! وای خۆمی پێش (٢٩) ساڵ چەند لە ئێستام دەچم.

لە ترافیکێکدا هەر وا وڕوگێژ لە خۆمەوە وەستاوم؛ گڵۆپ قرمزییە و ترافیک شلۆغە، بۆ چرکەیەک لە جامی پڕ شەپۆلی ئەمبولانسێکدا خۆم دەبینم، ژاکاو و مەلول دەستم بۆ ڕا دەوەشێنێت.. فریا ناکەویت جوابی بدەیتەوە، گڵۆپ کەسک بووە.

ڕادەکەیت.. خاو دەبیتەوە.. بە هەڵوەرە دەڕۆم.. لەسەر شۆستەیەک دانیشتووم و بیردەکەمەوە؛ بە و چالاییەی ڕۆحمدا بە میسلی پاژنە هەڵکێشێک دەچم و بە و خیسییەی زارم، لە سانتییەکی پیس.. بەهای هیچم نییە، میزەڵانێکی بۆشم، نە لە زەوی و نە لە ئاسمان، من لە فەزادا وەستاوم.

سەیرە! لە شارێکدا خۆکوشتن پێویستی بە بڕێک پارە ببێت، من سڵ لەخۆخنکاندن یان خۆهەڵواسین یان خۆکوشتن بە چەقۆ و ئاگر ناکەمەوە؛ هەر لەبەرئەوە نا کە ترسنۆکم، یان ئەوانەم پێ سوونەتییە و وەک کاراکتەری چیرۆکێکی نوێ، حەزدەکەم بە ڕێگایەکی تر خۆم لەناو ببەم.. نا. بەڵکو حەزدەکەم ئەگەر ئەو ژیانەی دەمەوێت، ناتوانم هەڵی بژێرم، با لانیکەم وەک نووسەرەکەم، مەرگم بە دڵخوازی خۆم ببێت. من حەزم لە خۆکوشتن بە دەمانچەیە.. یەک زرمە و تەواو.. نیوەشەوێکی هاوین، نە خوڕەی چەم بێ دەنگ بکات و نە ڕیتمی دونیا بشێوێنێت.. زرمەیەک تەنیا وەنەوزی چەند مەلێکی لانەواز و پەڕاگەندەی سەر درەختێکی کالیپتۆس بپچڕێنێت، کە خوداش نازانێت کێ ڕوواندوویەتی... ئەوەتا گوێم لە شەقەشەقی باڵیانە هەڵدەفڕن. تۆ گوێت لێ نییە..؟ سەیرە..!

بـۆ گەیشــتن بەو خەونەم، مـن نـاتوانم دەمـانچەیەک بکـڕم، دەمـانچەیەک کە لە لاجـانگی ڕاســتمەوە ســەرم هەڵبگرێــت و (٢٥) ســانتیمەتر ئێســقانی کەللەســەرم هەڵبتەکێنێــت. مــن دەمــرم، بەڵام دەزانــم هــیچ شــتێک ناوەســتێت، خــۆم نەبــم، کەواتە بــوونی مــن هــیچ نەبــووە، ئەمە داخــم دەداتــێ.

هەنگاوەکــانم زۆر گەورەن، دەبێــت پەلە نەکەم.. هێنــدە گەورە، خەریکــم هەڵدەتلێشــێم. ئەم قــاچە شــلوشــەوێرانەت دەرەقەت نــایەن، ئەگینــا لەوە زیــاتر فرێیــان دەدەیــت.. ئەمە ئەو هەنگــاوانە نــین کە مــن لە زەینمــدا دەیاننێم.

نــایەن.. بەدوامــدا نــایەن.. دەبێــت تیماریــان بــکەم، ئەم برینــانە لە نــاوەوە خواردوویــانم، پێویســتیان بە ســاڕێژە. تــۆ بــڕۆ، مــن ئێســتا نــایەم.. خــۆم نــاهێڵم بمــرم؛ خــۆ هــیچم پێنەکرێــت، دەتــوانم کەمێــک چــاودێریی خــۆم بــکەم.. وەک ئەوەی لە ئــاو نزیــک نەبــمەوە، ســاڵێک لەبەر چــرا دانیشــم و فیوزێــک چــاک نەکەم، یــا خــۆم نەهــاوێمە بەر ماشــێنە شــێتەکانی ئەم شــارە.. نــــا، مــن پیــادەگەڕێکم وێــڵ، بەیــانی تــا ئێــوارێ بەم جــادانەوەم، هەر ســواری ماشــێن نــابم.. نــــا بەو شــێوەیەش مــرۆڤ بــێ دەســەڵات نیــیە؛ بونیام هیچی پێ نەکرێت، دەتوانێت کەمێک مردنی خۆی ماتڵ بکات.

تــۆ دەبێــت مــۆڵەت لە مــردن درێــژ بکەیــتەوە تــا ئەم قاچــانەت چــاک دەبــنەوە، هەرچییەکــت کــردووە، بــگەرە دەرەوە.. ئەم قاچــانەی تــۆ لەلای سســتەری ڕووخــۆش و دکتــۆری بەویقــار نەبێــت، نەشــتەرکاری ناکرێــت.. بــۆ چاکبوونەوەیــان مــن کــاتێکم پێویســتە؛ ئــاخر لەم مەمــلەکەتەدا، قــاچ لە هەمــوو شــتێک پێویســت تــرە. بۆ ڕۆیشــتن نــا، بــۆ هەڵاتــن لێــی. کەچــی مــن ئەو قاچــانەم بــۆ هەڵاتــن ناوێــت! نــــا.. ڕێــک و ڕاســت دەمەوێــت بە خــۆمەوە بــن، بەم جەســــتە شــێواو و کۆتەرەئاســــایەوەم.. ئاهــــ.. ئەگەر بتزانییــا چەندم ئیش بەو قاچانەمە.. ئاهـ..!

ماوەیەکە ئەمبولانس زۆر دەبینم، جاران وا نەبوو، یان هی ئەوەیە من چاو لەسەرشت زۆر ورد دەکەمەوە، یان بە جادەدا زۆر دەڕۆم، یان نا.. هەر بەڕاست من لە شارێکدا دەژیم، ماشێنی تێد نییە، ئەمبولانس نەبێت.. دەڵێیت خەڵکی ئەم شارە یەکپارچە بیمارن.. ئەمبولانسێک بەلاتدا فرتە دەکات، بڕوانە بزانە خودا ڕێگەی دانەناوە، بن دەستی من نەبێت. باوەڕ ناکەیت کەس هێندەی تۆ ئەمبولانس بەلایدا تێپەڕیبێت.. جارێکیان کەژاوەیەک ئەمبولانس لە بەردەممەوە ڕێیان بەستبوو، ئەوەی پێشەوەیان تەرمی گۆرانییەکی تاقانەی تیابوو، فیشەکێکیان نابوو بەسەریەوە، فەقیرە دایکی بۆی دەگریا، کارێکی بۆ دەکرد، هەر مەپرسە.. ڕۆژێک دانەیەکی دی بەلامدا ڕۆیشت، ئاسکێکی کوژراوی تێدا بوو.. شەبەقییەکیان ئەمبولانسێک بەلاتدا لوراندی، بزنەکێوییەکی تێدا بوو، پاوانە لە قاچیدا بوو..! من سوتفەی ئەو ئاژەڵە بیمارانە زۆر دەکەم؛ چۆلەکەیەکت لەسەر دەستەبەرەیەکی سپی بینی، سەریان پێچا بوو، گوایە منداڵێکی چەتوون سەری شکاندووە.. تەریق دەبوومەوە، ئەم شارە چەند حورمەتی فڕندە و ئاژەڵ دەگرێت.

بروسکەیەک لەپشتتەوە دێت، چاوت ڕێشکە و پێشکە دەکات، خەریکە هەناسەت بووەستێ و دڵت لەسەرخۆ چووە.. هێور هێور گوێت لێیە، دەڵێیت لە زەمەنێکی ترەوە کەسێک جوێن بە تۆ دەدا.. هەر تاوێکە و چوویتەوە ناو خۆت.. بیر لە شتی شێتانە دەکەیتەوە، شتی سەیر سەیر؛ بیر دەکەیتەوە ئیشی مرۆڤ ئەوە نییە دەستکاریی شتەکان نەکات.. نا.. ئەوە کاری مردووەکانە.. مرۆڤ دەبێت دەست بدات لە هەموو شتەکانەوە، شوێنگۆڕکێیان پێ بکات.. من ئێستا کە لەسەر ئەم کۆمپیوتەرە دانیشتووم و ئەم چیرۆکە دەنووسم؛ دەڵێیت هێزێک دەستم دەجووڵێنێت، من ئەم پیتانە نانووسم، هەستێک لەسەر کیبۆردەکە پەنجەکانم دەجووڵێنێت، هەر لە خۆوە دەڵێیت ئەم نووسینە لە ئەسڵدا هەیە و من ئێستا وا لەنێوان دوگمەکانی ئەم کیبۆردەدا وردە وردە

دەیـــدۆزمەوە.. ئـــاخر وەک یـــارییەکی منـــداڵانە، کە ئێســـتا نـــاوەکەیم بیرچـــووەتەوە، ئەم شـــتانە لە شـــوێنی خۆیانـــدا نـــین، دەبێـــت دەســـتکارییان بکەیـت.. بیـانخەیتەوە شـوێنی خۆیـان.. نـــا.. شـوێنیان بـۆ پەیـدا بکەیـت. مـــن دەبێـــت دەســـت لە هەمـــوو شـــتێک بـــدەم.. قورســـەکان بجـــووڵێنە و بچووکەکـــان بەشـــەق فـــڕێ بـــدە، تـــا لە جێگەکەیانـــدا ئەو کەنـــزە شـــاراوەیە بـــدۆزیتەوە.. ئەســـڵی یـــارییەکەش کەنـــزەکە نیـــیە، جووڵانـــدنەکەیە، بیـــرت نەچێت.

مـن هەر وام بیردەکـردەوە، بـۆیە دەسـتم بـۆ کوشـتنیش بـرد.. هەرچەنـد لە جـاران غەمگـین تـری کـردووم، بەڵام لێـی پەشـیمان نـیم.. لـێمگەڕێن دەسـت بـۆ هەمـوو شـتێک دەبەم؛ دەبێـت شـوێنی شـتەکان بـدۆزینەوە، ئەم ژیـانە لە یاریی جوڵاندن و دۆزینەوە بەولاوە، شتێکی تر نییە.

مـن پێویسـتم بە کەسـێکە تونـد ڕامبتەکێنێـت و بمـداتەوە دەسـت خـۆم، مـن لە خـۆم ونبـووم.. تـۆ کە شـتێکت لـێ ون دەبێـت، دوای قەیـرێ سـەرا و بـن کـردن، لە شـوێنێک دەیبینیـیەوە.. زۆر جـاران ئەو شـتانەی لێـت ون دەبـن، لەو شـــوێنانەدان کە هەر عەقڵـــت بۆیـــان ناچێـــت، دەڵێیـــت پەیوەنـــدییەکی نهێنـــی لەنێـــوان شـــوێن و ونبوونـــدا هەیە، کەچـــی مـــن ئێســـتا کە ونـــم، زەب و زیندووش خۆم دەبینم، بەڵام بۆم نادۆزرێتەوە.

خەریکـی بە شـتی پڕوپـووچەوە خـۆت مـژوڵ دەکەیـت؛ کەم کەم تێـدەگەم، مەرج نیـیە بینیـنەوە، دۆزیـنەوە بێـت، کەچـی ئەمە بـۆ مەسـەلەی کـلیلەکە وا نەبـوو.. ئـــا.. ڕاسـت دەکەیـت، ڕووخسـەت بـدە ئەوەیـان بـۆ بگێـڕمەوە؛ مـــن ژنـــێکم هەیە نیـــانتر لە ســـێبەری شـــۆڕەبیی ســـەر حەوز، کەچـــی لەگەڵ کلیلـــدا ناتوانێـــت بەو شـــێوەیەی خـــۆی بێـــت کە هەیە.. ئەویـــش وەک مێـردەکەی، دەڵێیـت دوو کەسـە لەنـاو کەسـێکدا، ڕەنـگە سـەبارەت بە کلیـل، ئەو کەســـەیان بێـــت کە کەمتـــرین جـــار دەیبیـــنم.. ئەویـــش خـــۆی نمـــایش ناکات، تۆ لە داوەکانی خۆتدا چاوت پێی دەکەوێت.

ئەو ژنەی مــن لە دونیــادا هیچــی لـــێ ون نابێـــت؛ بیــری ناچێـــت ســـاڵی (١٩٨٢) کرێچیــی کــێ بــووین.. لە پــۆلی ســێی ســەرەتاییدا، پــێڵاوی ژمــارە چەنــدی دەکــردە پێــی.. ســاڵی پــار هــۆدەی نوســتنمان چەنــد تەبەق تەپەدۆر بـــووە.. وەســـتای بەلـــوعە چـــاککردنەکەی ســـاڵی دوای ڕاپەڕیـــنەکە، ســـەعاتەکەی کـــۆیرتز بـــووە.. هەمـــوو ئەو وەرەقەی کارەباییـــانەی لەدوای هاتنمــان بــۆ شــار، بۆمــان هــاتبووە و مــانگی چەنــدمان بــۆ هــاتبووە، هەمــووی لەبەربــوو.. ڕۆژێــک بــۆ خۆشــی پێتگــوت: "مــانگی یــانزەی ســاڵی (١٩٩٢)، چەنــدمان بــۆ هــاتبووەوە؟" وتــی: "مــانگی یــانزەی ســاڵی (١٩٩٢) وەرەقەی کارەبامــان بــۆ نەهــاتەوە، بەڵام مــانگی یــانزەی ســاڵی (١٩٩٣) چــوار دینــار و مـــانگی یـــانزەی ســـاڵی (١٩٩٤) هەشـــت دینـــار و مـــانگی یـــانزەی ســـاڵی (١٩٩٥) هەژدە دینار و سەد و پەنجا فلس..."!

ئـــاوابوو.. نـــازانم بەو بیرتیـــژییەوە، چـــۆن چـــۆنی کلیلـــی ون دەکـــرد؟ وای لێهـــاتبوو تـــۆ بـــۆ دەرگـــای ژوورەکـــانی میـــوان و نوســـتن و نانـــدێن، یەکـــی دەســـتەیەک کلیلـــت دروســـت کـــرد بـــوو، دەســـتەیەک کە هەمیشـــە دواهەمـــین کلیلیـــان دەرگاکـــانی دەکـــردەوە. ئەوە هەورەبـــانەکە هـــیچ، لە ســـاڵی لافـــاوە زۆرەکەوە، کلـــیلەکەی ون بـــووە و نەمـــان کـــردووەتەوە.. ئەو ژنەی تـــۆ لانـــیکەم هەفـــتەی دوو کلیـــل ون دەکـــات.. مـــن بـــێ چەنـــد وچـــوون بەشـــێکی مانگانەکەم لە دروستکردنەوەی کلیلدا تیادەچێت.

ئێســـتا ئیتـــر وەک ئاســـنێکی بەر بـــاران ژەنـــگ خـــواردوومی.. بە وێـــنەی مەســـینەیەکی کـــۆن، بەڵغـــم کـــردووە.. ئەوەنـــدەم تـــوێخ لـــێ بـــووەتەوە، هـــا ئێســـتا هـــا تـــۆزێکی تـــر، ئەودیـــوم دەردەکەوێـــت.. بە هەمـــوو تەمەنـــت هێنـــدەی ئەم ســـێ مـــانگەی دوایـــی، نەگۆڕاویـــت؛ گـــۆڕانێکی خێـــرا و ناسروشـــتی.. خەریـــکە دەیکەیـــت بە خـــوو، لە کۆڕوکۆمەڵـــدا بەتەنیـــا و لەگەڵ خـــۆم؛ ڕیپـــۆقی چـــاوی خومـــار و چلْمـــی ئەو کونەلـــوتە درێـــژانە و چڵکـــی گـــوێیە ڕەبەکانـــت دەخۆیـــت.. چێـــژ لە تـــامی تـــاڵ و تفت و ســـوێریان دەبیـــنم.. بە پـــێچەوانەوە هێڵـــنج دەدەیـــت لە بەرامـــبەر خەڵکـــی تـــردا؛ قەشـــمەریت بە

جـوانی گوڵێـک دێـت.. مـن جـاران وا نەبـووم، نـازانم بـۆ چـاوم بە کەس هەڵنـایەت، بە منـداڵە سـاواکانیش، ئەوانەی کە هەموویـان جـوانن، ئـاخر مرۆڤ لە ساوایەتیدا نەبێت، ئیتر بەدرێژایی تەمەنی جوان نییە.
ئێمە منداڵمان دەبێت و من حەزم لێی نییە..
تۆ لە خۆتەوە بیر لە کوشتن ناکەیتەوە..!
مـن ئیتـر خەڵکـم خـۆش ناوێـت، تەنهـا وەک خـۆت لە بیـری ئەوەدایـت ئەم ژیـانە بـۆ مـرۆڤ شـایان نیـیە.. هەر لەبەر ئەوەیە ڕقـم لە هەر لە دایکبـوونێکە.. ئەمـڕۆ پەسـتیت لەوەی کە خـۆت دەبینیـت خەریکیـت ئەم هـیچ و پـووچێتییە درێـژ دەکەیـتەوە و منـداڵێک بـۆ ئەم دونیـا بـێ مانـایە، زیـاد دەکەیـت.. نـا.. وا مەزانـن مـن ڕقـم لەخەڵـکە و لەخـۆڕا دەیـانکوژم! مـن پیـاوکوژێکی دڵـڕەق نـیم.. تـۆ ئەگەر لەبەر خۆشەویسـتی نەبـایە، منـداڵەکەی خۆتـت دەکوشـت و کۆتاییـت بەم مـاجەرایە دەهێنـا.. تـۆ ترسـنۆک نیـت.. بە حاکمەکەشـم وا وت، بە دکتۆرەکـانیش، وتـم: "مـن ئەگەر ترسـنۆک بوومـایە، هەمـوو ئەوانەی ئێـوە پێـی دەڵـێن تـاوان، بەشـەو دەمکـردن".. تـۆ هاوڕێکـانی خـۆت بە ڕۆژی ڕوونـاک دەکوشـت.. لە کـازیوەدا.. لە چێشـتەنگاودا.. لە قرچەقرچـی گەرمـای بەر کوکوختییەکـانی هاویـنـدا.. لەعەسـرە فێنکەکـان و ڕۆژانـی زەمهەریـر و شـەختەدا.. لە بارانـدا.. بەشـێکی زۆری کچەکـانم لە بارانـدا کوشـتووە.. دەزانیـت لە باراندا، کوشتن تامێکی تری هەیە..؟!
تـۆ چـوار سـاڵە هەمـوو شـەوێک لەسـەریەک خەو بە فـرینەوە دەبینیـت؛ سـەرەتا وەختـە بـوو شاگەشـکە بـبم، خـۆمم دەبینـی لە لالەزرێکـی سـەوزدا، لە دامێنـی گردێکـدا؛ سـەر بەرەوخـوار نەرمە ڕاکردنێـک ڕامـدەکرد، باڵەکـانم دەکـردەوە. دەمـدان بە یەکـدا.. خێـرا خێـرا ڕامدەوەشـاندن.. گوێـت لە شـەقە شـەقیانە..؟ ئەوەنـدەم دەزانـی لە عەرد بـڕاوم و لە ئاسـمانم.. قەیرێـک دەڕۆیشـتیت و دواتـر بە پێچێکـی نیـوکەوانەیی، ئاڕاسـتەکەتت پـێچەوانە دەکـردەوە.. ئێسـتا چـونکە سـەربەرەوژێر بـوو، باڵەکـانم بە

کەماڵی ئارەزوو دەکردەوە و ڕەها ڕەها خۆمم دەدایە دەست نەسیمێکی فێنک.. با یاریی پێ دەکردم، بەرزی دەکردمەوە.. دای دەگرتم.. جار جار بۆ ئەوەی هاوسەنگیت تێکنەچێت، شەپۆلێکت دەخستە باڵەکانتەوە.. تۆ مەستی هەوای خۆت بوویت، کە زرمەیەک گەرماییەکی خێرای دەخستە ژێر باڵم و چەند گەزێک لە شوێنی خۆم بەرزی دەکردمەوە، دواتر خول خول، وەک پەڕۆیەکی تەڕ لە ئاسمانە دەکەوتیتە خوارێ، بۆچرووکی خۆمم دەهاتە لوت، ئەوە دوا شتە کە هەموو شەوێک من لە خەوەکەمدا هەستی پێ بکەم.

نازانیت دوای ئەوە چی ڕوودەدات، بێ ئەوەی خەوەکەت لێ بپەڕێت، وەک ئەوەی هیچ نەبووبێت، بەیانی بەخەبەر دێم.. ئەم خەوە بۆ شەوێک خۆشە، بەڵام وەختێک تۆ (١٤٦٣) شەو لەسەر یەک هەمان خەو ببینیت، ئیتر ئەمە لە خەووە دەگۆڕێت بۆ مۆتەکە.. شەوانی سەرەتا بەلامەوە سەیربوو؛ هەموو شەوێک یەک خەو ببینم.! لە سەرێکیشەوە لە دڵەوە حەزم لێیبوو، خۆ ئەگەر کۆتاییەکەی لابەیت، ئەو خەوە خەوێکی ناخۆش نییە.. دواتر وردە وردە لەدڵی ڕاهاتی ، ئاسایی دەهاتە بەرچاوت، هەمان لالەزار، هەمان بەرەو ژوورەکە، هەمان فڕین، هەمان سەمای دەم با، هەمان زرمەی نادیار، هەمان کەوتنەخوارەوە بەسەردا و دواجاریش هەمان بۆچرووک.. من ئەوەندە ئەم خەوەم دیبوو، ئیتر وەک ئەکتەری شانۆییەکی بێ تام، کە دەزانێت دەبێ لەکوێدا دیالۆگی خۆی بڵێت، دەمزانی لە کوێدا دەبێت باڵ بکەمەوە و لە کوێشدا بکەومە خوارێ.

تۆ لە خەوەکەتدا دەتزانی وات لێ دێت، کەچی هێشتا دەست بەرداری ئەو فڕینە نەدەبوویت. نەمدەکرد بچم بە لایەکی دیکەدا بفڕم، یان بفڕم و خێرا بنیشێمەوە. یان ساتێک بەر لە تەقەکە، خۆت بخەیتە سەر لا.. یان هەر نەفڕم.. کەچی نازانم بۆ وام نەدەکرد!

ئێستا لەبەردەرگایەکی ئاسنی کەپس ڕایان گرتوویت، دەنگێکی بێزار و قرغن، کە دیارە دوای شەوخەوێکی پچرپچڕ و کابوساوی، لە خەویان کردووە و ئەمە یەکەم پەیڤی ئەم ڕۆژە نوێیەتی؛ دەڵێت: "بیهێننە ژوورەوە.." گوێت لە جیرەی وشکی دەرگاکەیە..؟ چاوت دادەخەیت، ناتەوێت ئەودیو ئەو دەرگایە ببینیت. شتێک لە تۆدا وەختە بۆ ئاسمان بفڕێت، سەرت بۆ ساپیتەی ژوورەکە بەرزدەکەیتەوە، هەر بە چاوی نوقاوەوە دەڵێیت لەگەڵ خوداتە؛ بە سرتەیەک لەبەر خۆتەوە دەڵێیت: "چەندت پێ خۆشە، ڕامکێشە.. ڕامکێشە با پچڕێم.. بە جەهەننەم..!"

ئێستا لەم ژووری تیشک و سۆنارایە، لەژێر هەر تاڵێک ڕووناکیی ئەم ئامێرە کۆنەی ئەم فەرمانگە دێرینەی چاکسازی دەروونی دا؛ هەرچۆنێک وێنەی بگریت، بە ڕوونی دەیبینیت، گوێزانێک لەسەر لا، ئەو هەموو دەمارەی لە خۆیەوە ئالاندووە.. جارجار هەست دەکەم سەردەکات و گورزەیەکیان دەبڕێت.. لێیدەدەن لە چەقی کەللەمدا، هەست بە ترپەیان دەکەم.. هێواش هێواش سست دەبن.. دەمرن.. ئەوەتا شلەیەکی سوری تەڵخ، تەڵخێکی ڕەشبا و دزەی کردووەتە نا و ئەو زرکە بۆشەی سەرت.. گەرم و قەترە قەترە وا لە گوێمەوە خوێن دەدەڵێنێت.

٢٠٠٨

*** فلامینگۆ: ئەم وشەیە نزیکییەکی زۆر هەیە لە وشەی (فلامینکۆ- Flamenco) کە هەردووکیان بیانین و لە بنەڕەتدا یەکەمیان ئینگلیزی و دووەمیان ئیسپانییە. فلامینکۆ ناوی جۆرە سەما و دواتر جۆرە ئاوازێکی قەرەجانەی ئیسپانییە. بەڵام ئەم وشەیەی ئێمە بەکارمانهێناوە؛ (فلامینگۆ- Flamingo) مەلێکی سپی و پەمەیی (قو)ئاسایە لە خێزانی قازوقوڵینگ، ملێکی درێژی جوان و دوو باڵی گەورەی هەیە، هەر گەورەی باڵەکانی فڕینی لێ ئەستەم کردووە.**

# ڕۆکسالانا ئاناستاسیا لیسوفسکا

## تەوراتی ئەولیا بەختەتی ڕەیحانیی

**سیفری دروست بوون**

مـــاوەیەک بـــوو بیـــرم لە دروســـــتکردنی حیکایەتێـــک دەکـــــردەوە کە پـــاڵەوانەکەی بەدەســـت بـــێ قەراریـــی نـــاو بـــێ خەوییەکـــی کوشـــندەوە دەناڵێنێـــت. کـــاراکتەرەکەم هەرگیـــز دروســـت نەکـــرد، ئەو چانســـەی بێـــتە ژیانێـــک لە دەرەوەی ویســـتی خـــۆی، نـــازانم بڵـــێم بەخۆشـــحاڵییەوە یـــان بەداخەوە، لـــێ ســـەندەوە. ئیـــدیەکەم وەک بیـــرۆکەی دروســـتکردنی ئەو بـــوونەوەرە وا بـــوو کە خـــودایەک، جارێـــک، تەنیـــا یەکجـــار بەزەینیـــدا دێـــت بیخـــولقێنێ و نایکـــات، ئـــاوا ڕاگـــوزەر و خێـــرا خەیـــاڵەکەم؛ کە شـــتێک بـــوو وەک تەمـــی ناســـکی جێمـــاوی حیکـــایەتێکی کـــۆن لەســـەرمدا، هـــات و ڕۆیشت..

دەمویســـت تەدارەکـــی کـــارەکە وا ڕێـــک بـــخەم، کە خـــوێنەرەکەی ببێـــت بە بەشـــێک لە حیکـــایەتەکە، لە مـــن و کەســـێکی تـــر؛ هەر کەســـێک کە ڕۆژێـــک لە ڕۆژان و بەڕێـــــکەوت لە وڵاتێکـــــی دوور و تەریـــک و لە کتێبخـــــانەیەکی چەپەکـــدا ئەم چیـــرۆکە بخـــوێنێتەوە و خـــۆی لـــێ ببـــێ بە وێـــژەرەکەی، بە پاژێـــک لەو دێـــڕە خواروخێچـــانەی لەبەردەســـتیدایە.. چیرۆکـــی نـــاو خەیاڵـــدانی بـــێ بـــاکی مـــن، تەنیـــا بە نووســـین بە پایـــان نەدەگەیشـــت و ئەوە تەنیـــا نووسراوی دنیا بوو کە ئاتاجی خوێندنەوەی بە کەس نەبوو.

مـن مژۆڵـی نـاو گیرۆدەیـی لۆچـاولۆچی خـۆم بـووم و خەریـک بـوو لە دەرگـا داریـنەی قاوەخـانە چکـۆلانەکەی شـەقامی (سـۆدێرباری) دەچـوومە دەرەوە، کە کچێکـی ئـاڵی مـوو کـایی، بە دەنگێکـی شـەهوانیی، کە وات دەزانـی لە

دڵێکــــی تەنــــگەوە دێـــتە دەرێ، هـــاواری لـــێ کــــردم: "Ursäkta {بـــێ زەحـــــمەت...!}" بروســــکەیەکی گەرم بەســــەرمدا هــــات و ســــارد ســــارد لە ســــەری پەنجەکــــانمەوە دەرچــــوو، کــــچەکە لەبەردەمــــم دا کتێبێکــــی بەرگ چەرمینــــی کــــۆنی پێــــیە و دەڵێــــت کە لەســــەر مێــــزەکەی مــــن جێمــــاوە..! کتێــبەکە لەو پەڕاوە کۆنــانە بــوو کە هێزێکــی موگناتیســیی گەورەیــان هەیە و بەجــۆرێ ســەرنجی وڕ و تاســاوی بونیــام ڕادەکێشــێت کە نــاتوانی حاشــا لەخاوەنــدارێتی بــکەی، مــن پــاش ئەو ڕووداوانە و دوای ســاڵانەی ســاڵ لە دۆزیــنەوەی نهێنیــیەک، هێشــتا بــۆم ڕوون نیــیە، ئەو ئێــوارەیە؛ کە ئێســتا نــاوی دەنــێم (ئێــوارەی فریــو)، کتێــبەکە خــۆی، یــان ئەوەی بەدەســت کچێکــی کــاڵی قەشــەنگەوە بــووە، تەلیســم و کەمەندکێشــی نــاو ئەم کــاغەزە زەردانەی کــردووم، کە هێشــتا دەرچــوون لێیــان وەک ئەمەلــی ئــاوە لە سەرابستان.

یەکەمجــار کە شــەیتانم لەو کــافێیەدا لە (ســتۆکهۆڵم) بینــی؛ ئەو لە بەدلەیەکــی کــاڵی کــارکردن و مــن لە قەرقەشــەیەکی ڕۆحیــی گەورەدا بــووم؛ ئەو ڕۆژانە لەگەڵ ژنــی هاوڕێکەمــدا لە ئاریشــەی لەبــاربردنی ســکەکەیدا تێــداما بووین، کە وا بەو پــایزە ســاردە و وەک کــۆرپەیەکی جــێ بەخۆنەگرتــوو هێکــرا هێکــرا لەقەی لە ســکی ڕووتــی دایکــی دەدا و بەرێکەوتێکــی نــاخۆش لە مــن پــڕ ببــوو! ئاهــ... ئــێمە ئەو ڕۆژانە خەراپ گیرمــان خــوارد بــوو.. شــەیتان لەو دیــدارە کتــوپڕ و بــێ ژوانەدا کــوڕێکی چاوبــادامی گەنــج بــوو، هەرچەنــد یــادەوەریی خــۆم دەگوشــی بــێ ئەوەی بیناســمەوە ســیمایم لەبەرچــاو غەریــب نەبــوو؛ شــێوەی لە ئەکتەرێکــی فرانســی دەچــوو کە ئێســتا نــاوەکەیم بیرچــۆتەوە.. شــتێک لەودا هەبــوو کە هەرکەســێکمان بیــدیبا، هەســتمان دەکــرد پێشــتر لە کــات و جێگــایەکی تــردا بەخزمەت ئەم دەموچاوە گەیشتووین.

داهێــزران و نیگەرانیــیەک لە چاویــدا بــوو، کە هــی زۆر نووســتن بــوو، خــۆی گــوتی: "مــن یەکەمجــار بە بــاری تەعــالام وت ئەم هەمــوو نــازە مەیە بە

ئینسـان، ئەم مـاخۆلانە بچووکە ناسـرەوێت، دەسـت بـۆ هەمـوو دونیـا دەبـات؛ ئەوانەی وا هـی خـۆین و ئەوانەی هـی ئـێمەن، شـتەکان وا تـێکەڵ دەکـات مـن و ڕەبلعـالەمینیش سـەرمان لێـی دەرناچێـت". ئەوەی لە شـەیتاندا دەیترسـاندم؛ ئەو جـوان قسـەکردنەی بـوو بە کـوردی زارەوەی سـۆرانی، مـن هەمیشـە لەو کەسـانە ترسـاوم کە بە هەمـوو زاراوەکـانی زمانێـک بە پێرفیکتـی دەدوێـن و ئەوەم وەک جۆرێـک لە حەربـای سـەیرکردووە. وەک ئەوەی زۆر لە خـۆی بکـات بە خـاووخلیچکییەکەوە کە دەمـی بـۆ لەیەک هەڵ نەدەپچڕا، وتـی: "هاوڕێکانـت ڕۆژانە لە تخـوبی منـدا ئیشـەکانی خۆیـان دەکەن.. ڕۆژگـاری مـن تەواو بـووە، گوزەشـتم، مامۆسـتا بەسـەرچووم... مـن یەک ئیشـم هەیە؛ ئیتـر دەبـێ بنـووم"!. ئەوەتـا مـن سـەرم لەم دیـالێکتە تـێکەڵەی سـوڕماوە، بەڵام خـوێنەری خۆشەویسـت دەبێـت پێـت بڵـێم (نووسـتن) پڵـۆتی ئەم چیـرۆکە نیـیە و خەیاڵێشـت ڕەحەت بێت، من و تۆ ئیتر تا کۆتایی شەیتان نابینینەوە.

**سیفری دەرچوون**

( (بەناوی خوای گەورە و مەزن..

مـن کە بەنـدەیەکی بچـووک و بـێ نـرخ ئەولیـا نـاوم و قەزدی سـەفەر و گەڕانـی دنیـام هەیە بەیـارمەت خـوا یەکەم ڕۆژی مـانگی جیمـادی یەکەمـی سـاڵی١٠٦٥ شـاری ئۆسـکۆدارم بەجێهێشـت و بەدوای مەلیـک احـمەد پاشـادا رووم کردە ئەلایەتی وان ئەمەش بەسەرهاتی ئەو گەشتەیە: ))

٣٥٤ سـاڵ لەمەوبەر، ئەولیـا چەلەبـی لەم بەرگەی (سـیاحەتنامە)کەیدا، کە ئێسـتا وا لەبەردەسـتاندا و وەک دیـاریەک لە دوژمنـی خـوداوە گەیشـتۆتە مـن، لە فەسـڵی (اشـباح فـي مرآة)ـە باسـی حەکیمێکـی سـەیر دەکـات کە شـەوێکی سـارد و تاریـک لە نـاوچەیەکی کوێسـتانی، لە دامێنـی زنجیـرە چیـایەکی زنـار و گـردەڵە، لە بـاکوری خۆرئـاوای (ورمـێ)، لە ڕەشـەبایەکدا چـاوی پێـی کەوتـووە. حەکـیمەکە لەگەڵ کاروانێکـدا بـووە کە یـاقووت و

یەتیمـــــی لاچینیـــــان بە ســـــەفەرێکی تـــــولانیی و تاقەتپڕوکێنـــــدا لە (ســـەرنەدیبە)وە بـــردووە بـــۆ (بولغارســـتان)، ئەولیـــا لە وەســـفی ئەو حەکـــیمە غەریـــبەدا دەڵـــێ: ((لەپێشـــچاوم هەم ئاشـــنا بـــوو هەم ئەغیـــار مـــوو کـــاڵێکی میانەســـاڵی نەحیـــف هەمـــوو عەردی خـــوای تەقـــاوتەق دابـــوو بەحـــاڵی دنیـــا دیـــدە بـــوو بونیـــام ســـەری دەهـــاتە خـــورووو)) ئەوانەی ئەم بەشـــەیان لە سیاحەتنامەســـیدا خوێنـــدۆتەوە و بەخـــزمەت چەلەبـــی خـــۆی گەیشـــتوون، دەڵێن؛ کتومت ئەوە وەسفی ئەولیایە بۆ خۆی..!

ســـەفەرنامەکەی چەلەبـــی کە وا بەدەســـتی مـــنەوەیە و تـــۆش دەیبینـــی، نـــومرەی قەبـــووڵی لە قەرائەتخـــانەی تۆپقـــاپی لە (ئیســـتانبوڵ) وەرگرتـــووە، بەخەتێکـــی باریـــک بەڵام درشـــت نوســـراوە، مـــن لە فەرهەنـــگە گەورەکەی خەتـــدا کە (شەمســـەدینی ســـامی) نووســـیویەتی، دیـــتم ئەمە خەتێکـــی فارســـی-عەرەبـــی قەدیـــمە و لەبەرئەوەی ئەلیفەکـــانی درێـــژ و کۆتـــایی پیـــتە خوارەکـــانی تەنـــک و تیـــژە بەنـــاوی ڕووەکێکـــی بۆنخۆشـــەوە نـــاونراوە.. لە حاشـــییەدا چەلەبـــی نووســـیویەتی: ((وەلەو ئەســـرارە لاکـــین نەکـــا لە یەومـــی پســـڵانا لەبەردەم خـــوای خـــۆم رووسیاهـــــ بـــم بایـــد حەقیقەتـــی پشـــتی ســـەفەرەکەم کە تەعبیـــرە لە کەشـــفی ئەعشـــابێکی شیفاهـــ بـــۆ لەبارخســـتنی ســـکی (خەدیـــم)ی ژنە بچـــووکی ســـوڵتان (ســـەلیم خـــان) کە بە فیتـــی شـــەیتان لە (مەلیـــک احـــمەد پاشـــا) پـــڕ بـــووە بـــۆ پەیـــدۆز و خـــۆنەوارانی دوارۆژ ســـەجل بـــکەم)). مـــن دوای مـــاوەیەکی زۆر ســـۆراخ، لە قاموســـی (بورهـــانی قـــاتیع)دا و بەڕێـــکەوت لە گەڕان بەدوای واژەکـــانی تـــری خیانەتـــدا ئەو ســـەرەداوەم کەوتە دەســـت؛ کە ئەم کتێـــبە بـــۆ بـــۆنی ڕەیحـــانەی لـــێ دێت..؟

### سیفری ئەولیا

لێـــرەدا و وەکـــو خـــۆی _تەنهـــا ڕێنووســـەکەی دەگـــۆڕم_ یەکێـــک لە گفتوگـــۆ قووڵەکـــانی نـــاو کتێـــبەکەی بەردەســـتم دەنووســـمەوە، کە حەکـــیم و چەلەبـــی

شەوێک لە بارەی ڕۆحەوە لە گوندی (گویزەل سو)ی نزیک ورمێ، لە سەرسنوری مەملەکەتی فارسدا کردوویانە و وابزانم ئەولیا ویستویەتی لەسەر ئیزنی حەکیمە نەناسەکە، گیایەکی لەباربردن بۆ ژنی سوڵتان؛ کە بەخیانەتێکی قورس لە نزیکترین هاوڕێی خۆی پڕبووە، دەستبخات:

((جەنابی حەکیم.. کە پیاو نوتفەیەک دەخاتە لەشی ژنێکەوە وەکو ئەوە وایە تۆوێک بخاتە ناوعەردەوە و ڕۆژ بە ڕۆژ ئاوی بدات، تا ئەم تۆوە سەوز ئەبێت و پەل ئەکوتێ و دێتە دەرەوە و ئەبێت بە درەخت، بەڵام هەروەک چۆن تۆوەکە درەخت نییە، ئاوهاش نوتفە ئینسان نییە))

((درەختەکە خۆی تۆوەکەیە بەڵام لە حاڵوبارێکی ترا، عەرزت بکەم لە هەوایەکی ترا، ئەوەی ئەسڵە تۆوەکەیە نەک دارەکە، نوتفەش هەم تۆو و هەم گەوهەری ئینسانە لە پاکترین و شیاوترین باردا))

((حەکیمی نەناسی بەختی من.. مەسەلەکە بۆ منالّی زۆڵ فەرقی هەیە، ئەمە بۆ سەر زەمین عبوری غەزەبە. وا لەدایکبوو بە شەش پەلەوە، وا خوا ویستی ئەو دوو زیناکارە بە جەزای تولفێکی نوقسان بات، شتێک بێتە دەرەوە وەکو عیبرەت. وا ئینسانێکی جیاوازمان لە ئینجازی ئەم خیانەتە بینی))

((ئەولیا.. ئەرخەیانبە، تەبیعەت ئەوەنەی پێی کراوە لە غەدری بەشەردا درێغی نەکردووە، لە جنوبی شەرقیەوە تا شیمالی غەرب، بە فەرقێکی کەمی سورەت و کاوکاوێ قەوقیافەمان، هەموومان تەشابیهین.. تۆ ئەفەرمووی ئینسانی جیاواز..! ئینسانی جیاواز کوا..؟ کەسێک لە قوڕتوبە و من لە خۆراسان و بەندەیەکی خوا لە چینوماچین وەکو یەک واین.. هەرسێکمان دوو دەست و دوو قاچ و یەک سەرمان هەیە، هەندەسەی ئەعزای بەدەنمان کتومتە.. کەی تەفاوتی مابەینی دوو بەشەر وەکو فەرقی نێوان خەرگوش و زەرافەیە..؟ لە کاری ئیلاهی سەرم ئەسوڕمێ، سەدەها چەشنی پەڕەندەی هەڵداشتۆتە ئەو عاسمانە، کەچی ئەم حەشاماتە ئەحسەن تەقویمەی خۆی کە ئیسمی لێناوە

بەشـەر، لەسـەر ئەم عەردە خـڕە، بەیەک نەوع خەلـق کـردووە..! لاکـین دەر مەوزوع نـوتفە گەوهەرە، مەعـدەنێکە کە ژەنگـی ژیـان نەیگرتـووە، ئەینـا برای ئەلعان و قیامەتم، ئینسانی جیاواز کامەیە..؟))

((جەنـابی حەکـیم.. ئەگەر ئەو گەوهەرەی جەنابـت دەفەرمـووی، ڕۆژێـک تەشـریفی هێنـایە ئەم دنیـایەوە و سـەیرمان کـرد؛ زاڵـمە، بینیمـان خوێنخـۆرە، تماشـامان کـرد؛ گـورگێکە لە خۆیـدا و وەعشـییەکە بـۆ ئەو ئەهـلە، ئـێمە لەم سـەرەوە بـۆ ئەو دڕنـدەیەی موسـتەقبەل پەت نەکەیـن..؟ بـۆ بییەڵـین بێـت..؟ ئـاخر پیـاو بـڕی فـامی هەبـێ، ئەم ئـاگرە بـۆ لەمـاڵی خۆی بەردا..؟))

((ئەولیـا بەگ.. ئەویـان لە عیلمـی بچـووک و نـاچیزی ئینسـاندا نیـیە، پیـاوی ژیـر ئەگەر و مەگەر نـاهێنێتە جەڕ و بەحسـێکەوە کە خـۆی دەسـتی تیای نییە، لاکین...))

((حەکـیم ئاغـا.. هەمـوو شـتێ بڵـێ و بەس مەفەرمـوو ئەمە لەدەسـت خودایـایە، ڕجـا ئەکەم ئینسـان لەم زووڵـمە کەبیـرەی کە هەروا خەریـکە لە خۆی دەکات، بێ بەری مەکە..!))

((ئەفەنـدی.. ئەمە پێـی دەڵـێن ئیزهـاری نەزەر! ئەولیـا.. تـۆ پیـاوی خـوای، نـامومکینە زاتـی ئیلاهیـی لەم جەڕ و بەحسـە بکەیـنە دەرەوە، دروسـتە پێشـتر قەرارەکە لە دەسـت ئینسـاندایە، بەڵام کە ئـابی حەیـات کەفـتە ڕەحمـی مـادەرەوە، ئیشـەکە نقڵـی بەردەم تەعـالا ئەبـێ.. خـوا خـۆی زاهیـر و بـاتینە، پێـی خـۆش نیـیە ئەم بەنـدە بچـووکە دەسـتبخاتە ئیشـییەوە، وە ئەمـا بەعـد بـا منـاڵەکە تەشـریف بفەرمـوێ؛ چـوزانین نـابێ بە نـوور بـۆ ئەهـل، وا ناکـات بـڕێ ئـازاری بەنـی ئـادەم کەمتـر بـێ، نـابێ بە بەرەکەتـێ کە پێچێـک لەم حەیـاتە تونـدەی ئینسـان شـل بکـاتەوە.. چـۆن تولفێـک دەکوژێـت کە عیلمـت لە حانیـا سـفرە، ئەوە بەشـەرعی خـوا قەتڵـی نەفسە و بەشەرعی خەڵکیش عەمدە))

((بێ قەزابی حەکیم.. ئەو تۆپەڵە خوێنەی ناو سکی لەیلەدۆنەیەکی بەکەڵکی میسلی خەدیم، ئینسان نییە، عەقڵ و شعووری نییە، چۆن فڕێیان و لەکۆڵخۆکردنەوەی دەبێتە قەتڵ..؟))

((مادام واتان فەرموو، ئەبێ ڕوخسەت بفەرمووی سوئالێک لە خزمەتاندا عەرز بکەم: کە ئایا بەنی ئادەم، کەسێکە عەقڵ و شعوری هەبێ..؟ ئەی ئەوەی نەیبوو، یان ئێمە وامانزانی نیەتی، یان هێشتا پێنەگەشتبوو، لەدەرەوەی جنسی بەشەرە..؟ پیاوی خوا! کەرامەتی ئینسان ئەوکاتە دروست نابێ کە پەلەکانی دروست دەبن.. من کە ئەم دەستکردە جوانەی خوا دەبینم چاوم پڕ دەبێ لە ئاو.. من ئینسانم خۆشئەوێ و ئیمانم پێیەتی لە عانێکدا نەخەملێووە و لە زەمەنێکا گەشە دەکا و لە کاتێکا تەواو دەبێ))

((جەنابی حەکیم.. بە هەوای ئەم شاخە ساردەی هەردووکمان بە ڕێبواریی ڕێمان تێیکەوتووە، منیش ئینسانم خۆشئەوێ، هەربۆیە ئەم سەفەرە تووشەم بۆ خستۆتە بەر خۆم.. بەڵام دنیاگەڕی گەورە، نوتفە لەم مەرحەلەیەدا ئینسان نییە))

((ئەولیا.. وردە وردە بەرچاوم ڕوون دەبێتەوە کە هەرشتێ ئینسان نەبوو؛ تۆ قەتڵی بە موجاز دەزانی..!))

((.........، ....................................،

...................... ))

((..........................، ................؟))

((......................!))

**سیفری ڕەش**

من کە ناچار بووم هەموو مێژووی عوسمانیەکان، لە بیرۆکە سەرەتاییەکەی خواجە ئەحمەدی یەسەویەوە و بە عوسمانی کوڕی

ئورتۆغڵـدا تـا عەبدولمەجیـدی دووەم بـۆ تێگەیشـتن و سـەر لـێ دەرکردنـی ئەم نهێنیـیە چەنـدین جـار بخـوێنمەوە.. هەمیشـە و لە چەنـد شـوێنی جیـاوازدا دەکەوتـم بەسـەر ئەو ڕووداوە نادیـارەی کە مێژوونووسـان ناویـان نـابوو (گرێکـوێرەی ئیمپراتـۆر)، گـرێکە گوزارشـت بـوو؛ لە ڕق لـێ هەڵگرتنێکـی ناکـاوی سـوڵتان سـەلیمخانی کـوڕی سـوڵتان سـولەیمانی قـانوونی، لە نزیکتـرین بـرادەری خـۆی بە نـاوی مەلیـک ئەحـمەد پاشـا، کە بە ڕێکەوتێکـی بـاوەڕنەکردە لە شمشـێری سـووری جەلادی دیـوانی (هۆمـایۆن) لە ئیسـتانبوڵ فریـادی دەبێـت و سـەڵتەنەت لەسـەدری ئەعزەمی دەخات و دووری دەخاتەوە بۆ ویلایەتی (وان).

لە گەڕانمـدا لە ئەورووپـای ڕۆژهەڵات جارێـک وەک کـۆچبەرێکی تـاراو و جارێـک وەک چیرۆکنووسـێک، تـوانیم بـگەمە شوناسـی ڕاسـتەقینەی خەدیمـی سـوڵتان؛ لە مـۆزەی مێژوویـی (سـۆفیا)دا و لە دیکیـۆمێنتێکی زەرد و پـواودا کە بـاڵوێزی ڕووس لە (کوشـتاندینا)وە نـاردویەتی، نوسـراوە؛ ((خەدیـم لە ڕاسـتیدا کیـژی کەشیشـێکی ئارتودۆکسـی ئۆکراینیە و نـاوی ڕۆکسـالانا ئاناستاسـیا لیسوفسـکایە و لەشـەڕی خاچپەرسـتەکاندا وەک غەنـیمە لە گونـدێکی بچـووکی سەرسـنوری مۆڵـداڤیا دەگیرێـت و لەبەر جـوانی و چـاوکەژاڵییەکەی هەر زوو دەگـاتە حەرمسـەرای سـوڵتان)) بەوەشـدا مـاهی دەوران؛ (گوڵبەهارخـان)ی ژنە گەورەی سـوڵتان ئیرەیـی پـێ دەبـا و لەغەمـی قوورسـی پـایەکەی خـۆی و مەترسـی داگیرنەکردنـی مێـردەکەی، دەکەوێـتە شـەڕێکەوە لەگەڵیـدا، کە بەسـەرکەوتنی کـچە کریسـتیانەکە و شـکانی خـۆی و دوورخسـتنەوەی بـۆ شـاری (پورسـا) لەسەر دەریای ڕەش، کۆتایی پێ دێت.

**سیفری خیانەت**

شـــەوێک لە گفتوگـــۆیەکی دوو قۆڵیـــدا لەگەڵ گەڕێـــدە و تـــاقە مێژوونووســـی ئیمپراتـــۆر، لە باخەکـــانی میرعەبداڵخانـــدا لە بەدلـــیس، مەلیـــک دەفەرمووێـــت: ((خیـــانەت بـــۆنی هەیە و بـــۆنەکەی شـــتێکی فێـــنکە وەک بـــۆنی ڕەیحـــانە)) ئەولیـــا زۆری دەبـــا، تـــا شـــتێکی زیـــاتر لە نهێنیـــیەکەی ئەو و ڕۆکســـالانا چنگبخـــات.. ئەحـــمەد پاشا لەژێـــر کـــاریگەریی قورســـی شـــەرابی شـــیری مایـنـدا و لە وەڵامـــی پرســـیارێکی زۆرزانـــانەی چەلەبیـــدا کە؛ ئایـــا خیـــانەت، بەخســـوس بـــۆ عـــالی مەقامـــان شـــتێکی دروســـتە یـــان نـــا..؟ مەلیـــک هەناســـەیەک هەڵدەکێشـــێت کە ئـــاهی ڕۆژگـــارانی زووی لـــێ دێـــتە دەرێ و وا جـــواب دەداتەوە کە خیـــانەت: ((قەرارێکـــی ڕاســـتە، ئەممـــا لە زەمەنێکـــی غەڵەتدا..)).

**سیفری ڕۆح**

ئەو کتێـــبەی شـــەیتان لەســـەر مێـــزی کـــافەیەک لە شـــەقامی ســـۆدێرباری لە ســـتۆکهۆڵم بـــۆ منـــی جێهێشـــتبوو، جـــۆرێکە لە جـــادوو، جـــادوویەکی ڕەش.. هەمـــوو جارێـــک لاپەڕەکـــانی دەگـــۆڕێن، بەوەدا ژمارەیـــان لەســـەر نیـــیە دۆزیـــنەوەی چیرۆکێـــک تێیـــدا زۆر دژوارە.. چەلەبـــی لەم کتێـــبەی شـــەیتاندا ســـەعات و بەرواری ڕووداوەکـــانی بەشـــێوەیەکی تەمـــومژاوی و قژقـــژ نووســـیوەتەوە، بەشـــێوەیەکی ئـــاڵۆز شـــەوڕۆژی دابەشـــکردووە بەســـەر ١٠٠ ســـەعاتدا و هەر ســـەعاتێکی بە ١٤ دەقـــیقە و نـــزیکەی٤٠ چـــرکە مەزەنـــدە کـــردووە. لەم کتێـــبەدا پاراگرافەکـــان جـــێگە دەگـــۆڕن و جـــاری وا هەیە لە ناوەڕاســـتی بەســـەرهاتی گەشـــتێکدا دەوەســـتێ و بەدوایـــدا چەنـد لاپەڕەیەکـــی ســـپی دێـــت، وەک ئەوەی نووســـەرەکەی بخوازێـــت چیـــرۆکەکە بە کەســـێکی تـــر تەواو بکـــات..! نـــازانم بـــۆ پـــاش ئەو دیـــدارە کـــورت و لەپـــڕە؛ وا هەســـت دەکەم شـــەیتان بیەوێـــت بە ســـتراتیژی خۆیـــدا بچێـــتەوە و ئەمجـــارە وەک دوژمـــن نـــا، بە ڕاســـتی وەکـــو دۆســـتێک هـــاوڕێیەتی ئینســـان بکـــات..! ئەولیـــا

له زاری شـــەیتانەوە نووســـیویەتی: ((ئایـــا خـــالیق ڕێـــگە دەدات بەم کاریســـەیە و لە زدی خـــۆی لـــوعبەکە نیهـــایەت بێـــت و ئیتـــر هەمـــووان تەجـرەبەی نەوعێکـــی تـــر لە حەیـات بـــکەن.. حەیـاتێکی مـوتەهەر کە نە ئەوی تێـدابێت و نە مـن..؟)) تیـۆری ژیـانی خـاوێن؛ ژیانێـک بـێ خـودا و بـێ شـەیتان بەشـێک بـوو لەو کونپشـکییەی مـن لە بیـرۆکەی هەمیشـەیی پشـتی کتێبەکەدا هەنوکە دەیخوێنمەوە.

## سیفری خۆشاردنەوە

مــن ئێســتا وا خەریــکە ئەم لاپەڕە پەرش و پەڕاگەنــدانەی لەبەردەســتمدایە، بە وەســـتاییەکی چیرۆکنووســـانەوە پـــێکەوە بنووســـێنم و لەتەکنیکێکـــی کۆلاجیـدا فیلێـک لە ئێـوە بـکەم و بـێ ئەوەی هەسـتی پـێ بـکەن، خـۆم و ژنـی هـاوڕێکەم؛ یـانی تـازە دۆسـتی مـن، بە سـکێکی نۆمـانگییەوە هەڵبێـین لەم دونیـا ڕەقەی ڕیـاڵەوە بـۆ بەهەشـتی کـاغەز، سـەرزەمینێک کە چـاوی کـز و کەمتینـی ئێـوە نـاتوانن بمـانبینن. بە ئەمانەتیشـەوە دەبـێ ئەوە بیڵـێم کە ئەم دەستنووســـە مـــوڵکی مـــن و شـــەیتانە بەیەکەوە، ئەوا بە ئاگـــاداری خۆیـان و لەسـەر ئیزنـی ئێـوە، مـن جـارێکی تـر ئەم چیـرۆکە دەنووسـمەوە و ڕەنـــگە نـــاوی بنـــێم؛ تەوراتـــی ئەولیـــا بەخەتـــی ڕەیحـــانیی.. کتێبێـــک؛ کە ئێـوارەیەک بە ڕێـکەوت لە کـافێیەکی چکـۆلانەی شـەقامی سـۆدێربارییدا لە ســـتۆکهۆڵم، نیشـــانی شـــەیتانی بـــدەمەوە، شـــەیتان؛ ئەو گەنـــجە چاوبـــادامییەی لە ئەکتەرێکـــی فرانســـی دەچێـــت و ئێســـتا نـــاوەکەیم بیرچۆتەوە..

**ستۆکهۆڵم**

**٢٠١٢**

# هێڵی ئاسنی پۆڵاند

## ٢:١٢ AM

بەفر دەبارێ..

بە قادرمەکانی گەیتی ژمارە سێدا سەر دەکەوم و بیری تۆ دەکەم...

کرێوە دەکات، سەرنجم لەسەر سکە قاوەییەکانی شەمەندەفەرەکە قەتیس دەمێنێ کە وەک پەیژەیەکی ئاسنی ژەنگاوی لە ژێر توێخێک سەهۆڵدا ڕاکشاوە و لێڵ تر دەنوێنێ.. ئەمشەو لە هەموو ئەو شەوانە سارد تره کە سەرما بێ ڕەحمانە تا ئێسقان بە تۆدا چۆتە خوارێ.... خۆم بۆ کۆناکرێتەوە، وابزانم خەیاڵ لەسەرمدا دەیبەستێ.. سەرخۆشێک شتێکم پێ دەڵێ، هیچ تێ ناگەم، خۆم وا نیشان دەدەم کە نامەوێ گوێم لێی بێت، درۆ دەکەم، لە زمانەکەی ناگەم.. دێتەوە بەردەمم، وەک بزمار چاو دەچەقێنێتە چاومەوە، نیگام لەسەر قەتیس دەکات، من زۆر لەوە دەترسم لە کاتی قسەکردندا بەرانبەرەکەم چاو ببڕێتە چاوم.. ئەمە شتێکی جاڕز کارە، ئەمە وەک ئەوە وایە کەسێ بەڕووتی سەیرت بکات، ئەو شتەی؛ تۆ لە کەسی قەبووڵ ناکەیت..! ئاخر هەموومان

حەرەمێکمـــــان هەیە.. بە درێژایـــــی مێـــژوو مـــرۆڤ دەیەوێـــت ئەو حەرەمە بپارێزیـت.. ئەمشـەو لە سـەرمای ئەم بەفـرەدا تیامـاوم.. بەفـرەکە قورسـە.. دەڵێـی هەر بـۆ مـن دەبـارێ، ئاسـۆیی و سـتوونیی لـەم وێسـتگە ڕوتەڵەیـەدا بەسـەرمـدا دێتـە خـوارێ.. هەستدەکەم بـەفر لـە زەویەکەشـەوە هەڵدەسـتێ و هـوروژم بـۆ مـن دێنـێ، ئـەڵێی ڕێکـەوتنێک لـەنێوان ئـەم کلووانـەدا هەیـە بـۆ ئـــەوەی ئەمشـــەو مـــن بکـــەن بـــە پارچەیـــەک بـــەفر.. شـــێرەبەفرینەیەکی ســـپیی.. لە حیرەتـــی ئەوەدام ئیتـــر ئەوەنـــدە ڕووت نەبـــمەوە، ئەوەنـــدە هەڵنەماڵرێم.. چاوم پڕبووە لە ئاو..

وێســـتگەکە چـــۆڵە، ژنێکـــی میانەســـاڵ چەنـــد مەترێـــک لەولای مـــنەوە وەسـتاوە.. سەرخۆشـەکە دەور و خـولی هەردووکمـان دەدا، بە تـیلەی چـاو لێـی دەڕوانـم، ژنەکـە وا لە سـێرەمدا، سەرخۆشـەکە لێـی نزیـک بۆتـەوە، ئەو تـــەنها بە وشـــەیەکی کـــورت پەرتەوازەی دەکـــات.. ئاهـــ گەر بمزانیـــایە چـــی پـــێ وتـــووە..؟! مـــن تەنیـــا ئەو چەنـــد پیـــتەم بەســـە بـــۆ ئەوەی دونیـــا بوەستێنم و هەموو کەسێک لە ئاست خۆمدا، بخەمەوە شوێنی خۆی..

**٢:٢٥**

شـــەمەندەفەر وەک مـــارێکی ســـڕ، لۆژەلـــۆژ بە ناڵەیـــەک تـــێکەڵ لە ئـــێش و زیکـەی گوێکەڕکـەری ئیسـتۆپی پێچکـەی پـۆڵای سـەر ڕێـگەی ئاسـن، شـەش مەتـر دوورتـر لە بەردەممـدا دەوەسـتێ. بـەخێرایی بۆیـاخی کاڵـەوبووی سـەر پلێتەکـە دەخوێمـەوە؛ (ژمـارە ٤٠٨ هێڵـــی ئاســـنی نێودەوڵـــەتیی پۆڵانـــد) خانمەکـە لـە دەرگاکـەوە نزیکتـرە، ئـەوەتا پـێش مـن ڕێـدەکات و سـەری مـن و پێچکـە بچووکـەکانی جانتاکـەی بەیەکـەوە دەخولێنـەوە، کـە بـە سـێ پلـە

لــە زەویەکــەوە دەفرێــت و لــە کۆنــە شــەمەندەفەردا بــزر دەبــێ. کە لە ڕاڕەوە تەنگەکــەی نــاوەوەدا بە دوای کابینەکەمــدا دەگەڕێــم ژمــارەی کوپــاکەمم بــۆ نــادۆزرێتەوە.. ژمــارەیەکی ئاســانە؛ ١٦ بەڵام هەمیشــە لەو جێگایــانەی بونیــام کــاری بە ژمــارەیەک دەبێــت، ئــەو خــۆی لــێ دەشــارێتەوە..! مــن دەیــان جــار لەگەڵیانــدا توشــی ئەم یــارییە بــێ تامــە بــووم .. وەک ئەوەی ژمارەکــان حەزیــان لە گەمە بێــت؛ ئەو شــتەی کە مــن ئێســتا لە توانامــدا نییە، لە ڕاستیدا بیرم نایەت من کاتێکم بۆ یاری دانابێت.

ئەم کــۆرە ڕۆژهەڵاتیــیە سەرڕەشــەم خــۆش دەوێــت... حــەز دەکــەم مــن دەست پێ بکەم، نازانم لە کوێوە.. بەخێرهاتنی دەکەم.

## ٢:٣٢ AM

کوپــاکەی خــۆمم دەبیــنمەوە.. پێشــتر دە جــار بە بەردەمیــدا تێــپەڕیم، مــن دەڵــێم ژمارەکــان فێــڵ لە بونیــام دەکەن...! نــازانم بــۆ نەمبینــی.. خــانمی هاوچــاوەڕوانی وێســتگەکەم لەوێ بــارگەی خســتووە، کە مــن دەرگــا شوشــەکەی کوپــاکە دەتــرازێنم، ئەو خــۆی بــە جێخەوەکەیــەوە ســەرقاڵ کردووە..

چەنــد خولەکێکــە لە کوپــاکەدا گیرســاومەتەوە دەمەوێ جــێگە خەوەکەم خــۆش بــکەم، کە سەرڕەشــی وێســتگەکە دەرگــاکە دەترازێنێــت و لــە کوپاکــەی منــدا وەک دیارییــەکی خــودایی هــەڵ دەتۆقێــت. کــە قــاچی مەحکــەم و ســەنگین دادەنێــت، بە لاچــاوێ ســەیری دەکەم، زۆر نهێنیئــامێز دیــار نیــیە، بەڵام وەک ئەوەی بییەوێــت شــتێک بشــارێتەوە، ســەری زۆر دەجولێنێ، وابزانم جێ بەخۆی ناگرێ.

بــێ گرنگیــدان، وەک ئــەوەی مــن پشــیلەیەکی پیســی کــۆڵان یــان ســەگێکی خــوێڕیبم و بــە هەڵــە مــوزاحیمی ئــەم خانەدانــە بووبــووم؛ بــە لاچاوێــک

نیگایەک دەکات، لە نیگای  دژی ئەودا من بووم بە شتێک، شتێک کە ناتوانم ئێستا بیگێڕمەوە.. بەس دەزانم کە من دەتوانم لە کاتێکی تردا بە درێژیی پێت بڵێم ئەو سەیرکردنانە چیین.. ئەو ڕوانینانەی کە شتێک لە سۆز، یان بەزەیی یان مەکریان تێدایە.. لە بەرانبەری دا دەنیشم.. ژانتاکەم دەخەمە کۆشم.. شەمەندەفەر لە بەدبەختیی من، درەنگ تر لەوەی کە دەبێ بڕوات، دەبزوێ.. من ئەمە ناو دەنێم کاتی زیادە.. کاتێک کە خودا تێیدا یاری لەگەڵ بەندەکانیدا دەکات.. شەرم دەکەم، لە خۆوە و لە دڵەوە دەبم بە قەترەیەک ئاو.. خۆم وا نیشان دەدەم کە زۆر ئاساییم، بەر لەخۆم، هاوکۆپاکەم دەزانێ کە درۆ دەکەم..

**٢:٣٧**

لەوە دەچێ ئەم کوڕە، ڕۆژهەڵاتییەکی قاچاخ بێت.. ساتێ دواتر کارمەندێکی ڕوسیی پیر جامخانەی کوپاکە دەترازێنێت، چێکی بلیت و پاسپۆرتەکان دەکات، کە بەڵگەنامەکانی ئەو دەخوێنێتەوە لێی دەپرسێ:

- Ist das ihre erste Reise? "یەکەمجارتە سەفەر بکەیت..؟"
- Sprechen Sie Deutsch! "ئەڵمانی دەزانی..؟"
- Hvad med dansk sprog? "ئەی دانمارکیی..؟"

کوڕەکە زۆر ڕۆح شیرینە، بەڵام لەوە ئەچێ بترسێ، خۆی بە پێڵاوەکانییەوە خڵەفاندووە، کارمەندەکە سەیری من دەکات و بڕۆی وەک دوو کەوانەی ناو قوبەیەکی شینی ئێرانی بە ئاسمانەوە هەڵدەواسێ.. ئەم کوڕە ڕۆژهەڵاتییە سەرپەشم وەک دیۆنیسوسێک دێتە بەر زەین، هەست دەکەم دەتوانێت شەویکی گەرم.. شەویکی دۆزەخیم بداتێ، بە شانی پتەو و پانی و بە باڵای بەرز و ڕێک و هەنگاوی سەنگینیدا هاتۆتە کوپاکەم.. ئەمە پیاوێکە دەتوانێ تا شەرای مەرگ ژن ئاسودە بکات.. هەست دەکەم ئەگەر چاوەکانم لێک نێم، وەک پڵنگێکی بریندار ئەم

پیـاوە هـورووژم بێنـێ.. جلەکـانم لەبەر دادڕێ.. پـارچە جلـە تەنکەکـانی ژێرەوەم دەبینم بەدەمیەوە توێ توێ دەبن.

بەڵگەنامەکانمـان لە لایەن ژنەکارمەنـدێکی پیـری ڕوسـیی‌یەوە پشـکێنرا، سـەیری بلیـتەکەی منـی کـرد و پرسـیارێکی کـرد، کە مـن بە خۆخڵەفانـدن بە قەیتـانی پێڵاوەکـانمەوە وەڵامەکەیـم خـوارد، دوو سـێ قسـەی تـریش دەکـات، نـازانم دەڵـێ چـی..؟ حەزم دەکـرد بەردەوام پەرسـڤی ئەو پرسیارانەی بە دڵمنین، ئاوها بە قەیتانی پێڵاوەکەمەوە.........

### ٢:٤٨ AM

هەموشـتێ باشـە.. ژنەی هاوکۆپـام شـتێک دەڵـێ، جـۆری فـۆنەتیکی وەک ستەیمێنتی پرسیارێ دێتە گوێ؛

- Willkomen "بەخێربێیت"

خـۆم وا نیشـان دەدەم؛ کە دارسـتانی ڕەشـی دەرەوە خەیـاڵی دوور بـردووم و ئاگـام لەوە نیـیە لە نـاو ئەم کوپـا داریـنە بچـوکەدا چـی دەگوزەرێـت.. ئەو وەک شـەڕانگێزێک جـامی بەشـی سـەرەوەی کۆپـاکە دەترازێنێـت.. هەوای سـارد بە هـورووژم خـۆی دەکـات بە ژووردا.. هێشـتا پـێم نەگەیشـتووە کە ئێسـقانم دەزریکێنـێ، لەپـڕ دەکەومە گومـانەوە لە جەسـتەم..! ئاهــ لەوەی ٣٩ سـاڵە درۆم لەگەڵـدا دەکـات.. مـن خـودی ئـازار نـاژیم، مـن تـا هەنـوکە ترسی ئازار ژیاوم..!

موعتـادەکە دەکشـێتەوە، شـەمەندەفەر ڕێـک لەبەردەم منـدا دەگیرسـێتەوە.. جانتاکەم ڕادەکێشم و بە سێ پلیکانە سەر دەکەوم..

ئەم ژنە پیرە بەبایە.. شتێکە لە تەرپۆشەکان، لەو ژنانەی هەرچەند دەکۆشن بیشارنەوە، کەچی هێڵی ڕەشی ژێرچاویان گورج تەمەنی زۆریان دەدرکێنێ.. تەڕاییەکی سەیر لەم ئافرەتانەدا هەیە.. هەروەک چۆن شەنگی نییە، ئەمە جوانییش نییە، نا ئەمە مێینەیەتییە، شلەیەکە کە لە دڵیاندا خەست بۆتەوە و لەژێر مەمکی چەپیاندا وەستاوە، هەمان ئەو بۆنەی پیاو دوور دوور فریو دەدات.. ئەو بەبایە ئەمشەو شتێکم لە دەست دەقەومێنێت.

خۆم وا نیشان دەدەم نوستووم، جارجار بە ئاستەم پێڵوی چەپم دەترازێنم، کابینەکە تار و نارۆونە؛ ئەو کورە لە ژێر چرا کزی کوپاکەدا دەیبینم وەک پەیکەرێک چاوی بڕیوەتە من.. لە دڵەوە حەز دەکەم بزانم ئەم سەرڕەشە خوێنشیرینە بیر لە چی دەکاتەوە..! خۆی لێ کردووم بە نوستوو، مەمکە تورتەکانی لە ملوانی درێژییەوە خەریکن تەشریف دێننە دەرێ، وەک ئەوەی شتێکی تیا پەنهانکردبن، ڕانە توورتەکانی توونـد جووت کردووە. چاوە بچووکەکانی بە عیشووە لێکناوە، سەرنجمی لەسەر کۆدەکەمەوە پێڵوی سەرەوەی دەتروکێت.. دەزانم نەنوستووە، ئەم ژنە بۆ وا دەکات..؟ ئەگەر ئێستە لێی بنیشێم.. لەوانەیە بقیژێنێ.. لەوانەیە کارمەندە ڕوسە پیرەکە بێتەوە، لەوانەیە میوانە کۆنەکانی شەمەندەفەرکە ئەوانەی لە وارشۆوە هاتوون بڕژێن بەسەرماندا.. لەوانەیە وێستگەی دواتر دامگرن و بمدەنە دەست پۆلیس... ئەو کاتە........

موعتادێک داوای یەک ئیرۆ لە من دەکات..

- lass mich in Ruh! "وازم لێ بێنە..!"

هەوا ساردە، من هێکرا هێکرا جگەرە دەکێشم، خەیاڵم لە شوێنێکی دیکەیە.. دوکەڵەکە بە فەزاوە دەیبەستێ.. ئێوارە ڕادیۆ گوتبووی ٢٥ ساڵە کوێڵن هێندەی ئەمشەو پلەی گەرمای دانەبەزیووە، سەرماکەی سارد ترە لەوەی بنوسرێتەوە، لێ شتێکی ناخۆش نییە.. هەستی پێ

دەکەم لە ژێـــر کـــابۆ کـــاڵەوبووەکەمەوە خـــۆی دەکـــات بە ژووردا و بە ئێســـقانمدا هەڵ دەشـــاخێ.. وا بـــزانم کەس لێـــرە نیـــیە، یەک دەقـــیقە بـــا سـەیرێک بـکەم.. کـوڕێکی سـەرڕەش، لەوە دەچـێ دوودڵ بێـت، خێـرا خێـرا سـەر دەجـولێنێ و ئـاوڕدەداتەوە.. جـێ بـە خـۆی نـاگرێ، لەوانـەیە پەناهاندەیـەکی ناپاسـایی بێـت، بـۆم گرنـگ نیـیە.. مـن سـەفەری هـامبۆرگ دەکەم، سـەبەینێ لە بـارەی نـامەی دکتـۆراکەمەوە گفتوگـۆ لەگەڵ پرۆفیسـۆرەکەم دەکەم کـە دواجـار دوای ئەو هەمـوو دوودڵـیە، خـۆم یەکلایـی کـردەوە و ناونیشـانی: ( Der Masochismus im Bezug auf die sexuelle Beziehung -مـازۆخیییەت لە پەیوەندییە زایەندییەکاندا)م بۆ نامەکەم هەڵبژارد.

لـە وێسـتگە سـاردەکەدا سـەیری ئـەو سـکرینە دەکـەم کە بە چرایەکـی نێـۆنی سـوور نوسـیویەتی ١٢ خولـەکی تـر شـەمەندەفەرەکـە دەگـات، سەرخۆشـەکە دەور و خـولی کـورە سەرڕەشـەکەی داوە، مـن ئـەوانم خـۆش دەوێـت، ئەلکهولییـەکان نـا، پەناهەنـدەکان.. نـاتوانم نـاوێکی تریـان لـێ بنـێم تـازە واهـاتووە، مـن ڕاسیسـت نـیم پێچەوانـەی هەمـوو ئەڵمانەکـان، مـن سەرڕەشـەکانم خـۆش دەوێـت.. ڕۆژهەڵاتییەکـان دەتـوانن ئینسـان ئاسـودە بـکەن، بەتـایبەت بـۆ ژنێـک کە تەمەنـی لە ٤٠ هەڵکشـابێ.. هەروا موعتـادەکە میـوانەکەی جـاڕز کـردووە، لە دڵەوە بـۆی دادەمێـنم، مـن خەریکـم بەم شـتانەوە چـاوەڕوانیی شـەمەندەفەر دەکێشـم و سـیگارەکەم لە ژێـر پێمـدا بە چزێکـی کـورت کە هەر نەگەیـوەتە گـوێم لە نـاو بەفرەکـدا خامۆش کردووە.

## ٢:١٢ AM

کــورێکی ســەرڕەش لــە شــانەوە دەڕوات، ســەری داخســتووە لەوانــەیــە خــەیاڵی ڕۆیشــتبێ.. لەوانەیــە بیــر لــە کەســێکی نزیــک بکاتــەوە لــە مەملەکەتێکی دوور..

جگەرەیەک گڕ دەدەم و بە قادرمەکانی گەیتی سێدا سەر دەکەوم.

تەماشا دەکەم بەفر دەبارێ..

٢٠١١

ستۆکهۆڵم

# دڵم نایەت ئەگینا دەمردم

بەفرەکە لەژێر پێمدا خرمەی دێت و من وڕ و هێواش هەناسەم توندە. دەرگای ئوتێلەکە دەدەمە بەر نوکەپێ و کەس لێم ناکاتەوە، ئەم شارە بۆنی سەگی لێ دێت.. من وام، کە زۆر بێ تاقەت دەبم، جوێن بە شار دەدەم. ئەو چاوەکانی ماندوون، دەستی درێژتر دێتە پێش چاوم، سەرێکی سیسەمەکەی لەگەڵ هەڵ گرتووم و دەمانەوێت بینووسێنین بە دیوارەکەوە، ئاخر من لای دیوارەوە نەبێت خەوم لێ ناکەوێت. خۆم بەدیوارە ساردەکەوە نوساندووە و هەست دەکەم دڵم هێواش هێواش سست دەبێت. سەگێک دەقروسکێنێت، من شەق لە دەرگاکە دەدەم و کەسێک نایکاتەوە.. نازانم لە تەنهاییدا یان لە سەرمادایە باوەشم کردووە بە خۆمدا.

هەموو ئەو شتانەی بەسەرمدا دێن، بەلامەوە دووبارەن. دەڵێیت پێشتر لە هەمان جێ، من هەمان شتم بینیووە. ماوەیەکە وام لێ هاتووە. دایکم چەناگەی گرژ دەکات و دەڵێت: "واهیمەیە." تۆ هێشتا بەلاتەوە زووە بۆ نووسینەوەی ئەو ڕۆژگارانەی لە ئوتێلە فەقیرەکانی شاردا ڕۆژت دەکردەوە. ئەو ڕووی لەودیوە و لە تەنیشتمەوە ڕاکشاوە، هەناسەیەکی درێژ و سارد هەڵ دەمژێت و هێشتا نەیداوەتەوە، کە من دەزانم هەموو ئەوانەی خۆشمان دەوێت، ئەوانە نین کە لە تەنیشتمانەوە نوستوون. دایکم دەڵێت: "واهیمەیە کوڕە ئازیزەکەم، لە سەری خۆتی دەربکە."

بە جووتێک پێڵاوی خەنەییەوە، تازە بەفری سەر شەقامە باریکەکە قاژ دەکەم، کەس بەوێدا ناڕوات یان دەڕوات و من کەس نابینم کەس..

ئەویش نابینم کەوا لەسەر سەرچەفە گوشتییەکەی سەر سیسەمەکە، بەتەکمەوە ڕاکشاوە. تۆ ئەو دەبینیت. پێویست ناکات لە گێڕانەوەی چیرۆکێکی وادا، شتێک بلێین کە دوورە لە مەنتیقەوە. من حیکایەتخوانی ڕاستەقینەی ئەم چیرۆکە، دەزانم کە تۆ ئەو شەوە ژنەکەی خۆتت دەبینی، بەڵام هەستت پێ نەدەکرد، دەشزانم عەرشێکی پان و گەورە لەنێوان بینین و هەست پێ کردندا هەیە.

تۆ لەم شەوە ساردەدا، کەس نابینبت، بەڵام هەست بە عەشاماتێکی گەورەی ئەو شەقامە دەکەین کە وەختە ببین بەژێر پێیانەوە. مرۆڤەکانی ئەوێ سەیرن، بەتەمەنەکانیان کورت و قەمبوور و منداڵەکانیان درێژ و لۆقنن.. چاوت بچووک دەکەیتەوە و وردتر دیقەتی ئەو ساوایە دەدەیت، کە هەتا ناوکی بە باوەشی دایکی و ناوک بەرەو خوار و لۆقە درێژەکانی وا بە دەستی باوکییەوە. دەستبەجێ فیکرت بۆ ئەو تیۆرە دەچێت کە پێی وایە جەستە بەپێی سروشتیی ژیان، گۆڕانکاریی بەسەر دێت. تۆ لات وایە ئەو قاچە درێژانەی مرۆڤی ئایندە، هی ڕاکردنن، ڕاکردن لەو درکە ڕێیەی ناویان ناوە ژیان.. هەتا خێرا تر بڕۆیت، زۆرتر دەکەویتە چەقی ئاپۆڕاکەوە، سڵ لە خۆت، لەو ژن و پیاوانەی لە پێشتەوە کۆڵەکۆڵ ڕێ دەکەن، دەکەیتەوە. دەوەستیت.. مات و حایر ماویت.. نازانم بۆ خەوم لێ ناکەوێت.

ئەو بە تەنیشتتەوە درێژ بووە و گینگڵ دەدات، پێڵووەکانی بە داخراوییش دەتروکێن. ڕەنگە نەخەوتبێت. تۆ دەیبینیت هەموو هەستەکانی خۆی لە چاوەکانیاندا کۆکردووەتەوە، وەکو ئەوەی بیەوێت بە چاو بژنەفێت. هەموو شت کشوماتە.. ئەو دەنگەدەنگە چییە لەناو منەوە دێت؟.. کاس بووم.. هێواش..!

وەکو هەموو ئەو ژنانەی دەیانناسم، ئەمیشم بۆ ڕام ناکرێت، یان خۆم نەمویستووە ڕامی بکەم. من هەر کچێکم بوێت لەم دونیایەدا، بە نیگایەک، پێکەنینێک، پیاسەیەک، دۆندرمە خواردنێک، هەر زۆر سرک

بێـت، بە دانیشـتێک ئەوەی بمەوێـت، لێـی دەکەم. کەچـی هەر لە سـەرەتاوە ئەم هاوکێشـــەیەم لەگەڵ (ژن)دا بــۆ پــێچەوانە بــووە، تەنیـــا بە چەنــد سـاتێکی کەمـی تەلەفۆنێـک، هەرچییەکیـان بوێـت پـێم دەکەن. لەدڵەوە ڕقـم لە ژنە و لە دڵیشەوە خۆشم دەوێن.

درێژایـی شـەقامەکەت کەرتکـردووە و وڕو هێـواش بە ملپێچێکـی کاکـاوییەوە هەڵ دەکشـێیت، کەس بە دەرەوە نیـیە سـەگ نەبێـت.. چ بـۆگەنێکی دێـت ئەم شـارە. مـن سـەرم لە بـۆنی ئەم ژنە ئاوسـاوە. قسـەیەک دەکەم، ئەو پێکەنینێکـی گـێلانە پـێ دەکەنێـت و دەڵێـت: "ئەوە پلایمـۆزی سـێیە، بـۆنێکی نەرم و ژنـانەیە." مـن پێـی دەڵـێم شـتێک لەنـاو تـۆدا، لە شـوێنێکتدا تۆپیووە. بیدۆزەرەوە و فڕێی بدە.

سیسـەمەکە جـێ دەهـێڵم، پەردەکە لادەدەم و لە پەنـجەرەکەوە سـەیری دەرەوە دەکەم، نـازانم چـی دەبیـنم، وەلـێ دەزانـم بیـر لەوە دەکەمەوە، کە نەدەبـا ئەوەنـدە سـەر بـخەمە سـەر ئەم ژنە. مـن وام؛ چـاو لەسـەر شـت زۆر ورد دەکەمەوە. حەقـی خـۆمە، مـن بە بـۆنی نـاخۆش تێـک دەچـم. ئەو ڕۆژە لە پاسـێکدا بەژنێکـی تەنیشـتمەوەم وت: "تکـایە خـانم.. کە لە سـووری مانگـانە دایـت، مەیە دەرەوە، مـن بەم بـۆنە هـار دەبـم!" ئەوەم وت و بەبـێ ئەوەی گەشـتبێتمە شـوێنی خـۆم، لە شـەقامێک دابەزیـم. شـەقامەکەت تەواو کـردووە بەدەسـتە چەپـدا، کەوانـی دەسـوڕێیتەوە بـۆ لای بـازاڕی ستیان فرۆشەکان.

بـا، یـاری بە پەردە گۆشـتییەکەی ژورەکە دەکـات، وەک ئەوەی بیەوێـت کەشـێکی ترسـناک دروسـت بکـات. سـاتێک وێـنەی پیـاوێکی لەسـەر دەردەکەوێـت، کە سـەری خـۆی گرتـووە بە بندەسـتییەوە و دەیەوێـت بـڕوات، وەلـێ نە پانتـایی پەردەکە ڕێـی دەکـات و نە هەنگاوەکـانی خۆشـی، زاتـی جووڵانیـان هەیە. پەردەکە دەمێکـیش لە کەوالیسـی شـانۆییەکی کلاسـیکی دەچێـت، کە بە ویسـتی دەرهێـنەر بە ئاسـۆی لەمسـەر بـۆ ئەوسـەر سـەما دەکـات.. ڕقـم لە پەردەی ژوورەکەیە، بە ژنەکەمـم وتـووە

من وەکو پەلکەزێڕینەیەک لە ڕەنگی کاڵ دروست بووم و بە ڕەنگی تۆخیش تێک دەچم. چەند جارم وت خانم با ئەو جلانەی ژێرەوەت، گۆشتییەکی تۆخ نەبن.. وای وەختە بمرم.

زۆرجار بیری دەچووەوە کە من مێردیم، شتەهایەکی دەگوت کە نەدەبا بی گوتبایە. چاوی لەسەر قەتیس دەکردم، دەزانم دەیروانی، دەشزانم کە نەی دەبینم. لێوی دەلەرزی و پچرپچر قسەی دەکرد، وەکو ئەوەی دەستێکی غەریبە و شارەزا بەر مەمکی چەپی بکەوێت، لەپڕ بێ دەنگ دەبوو. ئێستاکێ مرۆڤ وای مەزەندە دەکرد دەستە نەناسەکە چووبێتە گیرفانێکی ونەوە، بۆیە وا ئەو کەوتووەتە قسە و هەناسەبڕکێوە.

کە بەهۆش خۆی دەهاتەوە و منی دەبینی، هەموو ئەو کەشە نوێیەی بچووک دەکردەوە، هێندەی هەڵماتێکی شیری کە خاڵێکی شین لە چەقەکەیدا، مەنگ وەستا بێت، دەیخستە ژێر یەکێک لە پێڵووی چاوەکانییەوە. هەر بەسەر خۆشی نەدەهێنا کە شتێکی کردبێت. من هەر جارێک چاوم کردبێت، ئەو بریسکە ناچیز و سیحریەم لەژێر پێڵوەکانیدا دیوەتەوە و بیرم کەوتووەتەوە، کە ئەم ژنە چەند لە ژوورەکەی مندا ون و چەند لە خەیاڵمدا ئامادەیە.

بازاڕ چۆڵ و هۆڵ و دوکانەکان داخراون، کەچی من ئەو هەموو ڕەنگەی ستیانەکان یارییەکی بێ تام بە چاوم دەکەن، شینی کاڵ، پەمەیی، ڕەش، پڵنگی. دوکاندارە ژنانییەکە خەریکی ڕێکخستنی یەک دوو ستیانی تازەیە، زۆرزانانە دەیەوێت بەهۆی شێوازی ڕێکخستنەکەیەوە، بە مشتەرییەکان بڵێیت: "بڕوانن، بزانن ئەم موعجیزەیە چۆن مەمکی پڕ و خڕ و کەوانی، لە مەمکی درێژ و باریک و لات جیا دەکاتەوە." شۆڕشگێڕانە هوتاف دەکێشێت، "وەرنەوە.. دەتوانین دونیا لەسەر دەستی ئێوە و مەمکی ناو ستیانە ناسکەکانی من بگۆڕین." گوزەرە چۆڵەکەی ستیان فرۆشەکان جێ دەهێڵێت.

هەناســەم تونــدە، ژوورەکە بەشــی هەنســکی بووکەشووشــەیەک هەوای تێــدا نەمــاوە، ئەم ژوورە لە بەرەوە وانەبـــوو.. ئەو وەک هەر شـــتێکی بێگیـــان، وەکـو پەیکەرێـک، نـــا، وەکـو خـۆی ڕاکشــاوە. هەناســەکانی هێنـدە قـوولْ هەلْ دەمژێـــت، وەختێـــک دەیـــداتەوە، مـــرۆڤ وا دەزانێـــت بەو هەناســـەیە پەپوولەپایزەیەک دەنێرێت بەدوای خەونێکی دوور لە مەملەکەتێکی وندا.

لە مەکتــوبێکی بچووکــدا، لەســەر مێــزتەوالێتەکە بــۆم نووســیووە: "دلْەکەم، ئەگەر خۆشــت دەوێــم، چــاوەڕێم مەکە، مــن لە هەر ســەفەرێکمدا چــاوەڕێ کــــرابێتم، نەهـــاتوومەتەوە." دەرگــــاکەم لەدوای خــــۆمەوە داخســــت و بەو شــەوە بەفــراوییە، هــاتمە دەرەوە. دەشــزانم ئەو خــانمە بــێ گــوێیە، هێنــدە چاوەڕێم دەکات کە ئیتر نایەمەوە. دلْم نایەت، ئەگینا ........

دەی هـــیچ لە کۆگایەکـــدا بە مەیفرۆشـــێکی منـــدالْکار دەلْـــێم: بیرەیەکـــی ساردم بەرێ، دلْم زۆر پڕە.

٢٠٠٤

# مردووەوان

نــازانم چــیم بەســەر هــاتووە! خــۆم دەبیــنم لەنێــوان دایکــم و هــاورێ شــاعیرەکەمدا وا بەدرێژایــی شــەقامێکی جەنجــاڵ ڕێ دەکەیــن، کەس ســەیری ئەو بەرمــیلە زبــڵانە ناکــات کە ســەر ڕێــژ بــوون و لێیــان دەڕژێــت، کەس ســەیری خۆشــی ناکــات، کە بەتــاڵ و پــوچ دێــن و دەچــن.. ئەرێ ئەوە چیــیە؟ ئەو خەڵــکە بــۆ وەکــو کۆرســی ئۆکێســترایەکی ڕۆژهەڵاتیــی، بەیەکەوە زاریان داچڕیوە و سەیری من دەکەن؟

- هۆشــت بە خــۆت نیــیە حەیــاتم، ســێ ڕۆژە زای ئیلاهــی نەچــووەتە دەمتەوە.

لە گێــڕانەوەی دایکــمەوە دەزانــم ئاســایی نــیم، شــتێکم بەســەر هــاتووە، ئەگەرنــا ئەو خەڵــکە بــۆ چاویــان لە ئاســتمدا نــاتروکێنن؟ بــۆ ســەیری شتێک، شوێنێک، کەسێکی تر ناکەن؟

- ســەیری کەســیان مەکە بــاوکە گیــان، ئەگەر کەســێک تەلەفــۆنی کــرد، بڵــێ مــن کــوڕی جەبــاری حەرەســم و بــاوکم تــا ئەو مــزگەوتە چــووە، هــا ئێســتا هــا تۆزێکی تر دێتەوە.

بــاوکم ڕۆیشــت و مــن ئەو دۆســیە گەورانەم لە دۆڵابە شــڕۆڵەکەدا دەرهێنــا، کە نــاوو وێــنەی ســەدان مــردووی ئەو مردووخــانەیەی تێــدا تۆمــار کرابــوو؛ ئەو شــێتەی تــایەی گەورەی لــۆری ســەری پــان کــرد بــووەوە، ئەو میــراوەی لە چاڵێکــدا ئاســنی تەنکەرێکــی ئــاو دەچەقێــتە شــانی و لەنــاو ئــاودا ســێ ڕۆژ لەســەر یەک دەخنکێــت و دەمرێــت و دەخنکێــت و دەمرێــت، وێــنەی ئەو پیــاوە کــاملەی لە داخــی کوڕەکــانی، شــەوێک ســەعات هەشــت قلێشــێک

دەکەوێــــتە نـــاوچەوانی و دەتەقێـــت و دەمرێـــت، وێـــنەی ئەو شـــۆفێری تاکســـییەی دوای کوشـــتنی کـــچە ســـیانزە ســـاڵانەکەی لەســـەر نـــامەیەکی دڵـداری، وشـە سـادەکانی نـاو نـامەکە وەکـو نەخشـی سـەر بەردێکـی دێـرین، دەچـــنە دەموچـــاوییەوە. بە جۆرێـــک مـــرۆڤ لە ســـەیرکردنیدا دەبینێـــت، وشـــەکانی (چـاوەکەم) چـوونەتە جـێگەی هەردوو چـاوی و (ماچـت دەکەم) کە لە کۆتـایی هەمـوو نـامەیەکی ئـاوا سـادەی لاکۆڵانیـدا دەنووسـرا، ڕێـک دەچێـــتە ســـەر لێـــوی بـــاوکەکە و ئەویـــش دووبـــارە لەپێنـــاوی گێـــڕانەوەی حەیـادا، خـۆی دەکوژێـت.. وێنەکـان لە ژمـارە نەدەهـاتن، هەموویـان خـاوەن چیـــرۆک و فیلمـــی خۆیـــان بـــوون. کۆیـــان دەکەمەوەو لە دۆســـیە زەرد و کۆنەکانیان دەنێمەوە.

ئـــێمە هەرســـــێکمانین، بەرەو ســـــەرەوە هەڵ دەکشـــــێین و منـــــداڵێکی پـــاکەتفرۆش پاشـــەوپاش و ڕوو لە ئـــێمە بەرمـــان کەوتـــووە و بە مـــن پـــێ دەکەنێـــت، دانە وردەکـــانی دەبیـــنم کە تـــازە تـــوێژێکی زەردی جگەرەیـــان لە خۆیـــان گرتـــووە، هـــاوڕێ شـــاعیرەکەم دەیەوێـــت منـــداڵەکە دوور بخـــاتەوە و منیش هەستی پێ نەکەم.

- لە دونیـــادا لەوە دەترســـا منـــداڵ دوای بـــکەون و بەردی تـــێ بگـــرن.. بە منـــی دەوت ئەگەر شـــێت بـــووم، لە ژوورەوە بـــم بەســـتنەوە، ئـــاخر بەو ڕەشـیە نیـیە، مـن پێسـتم زۆر ناسـکە، یەک بەردم تـێ بگـرن، هەمـوو گیـانم دەتەقێت.

دایکم دەڵێت:

- حاڵا خراپ خۆم.. بەساقەوبم ئێستاکانێ شعور و شتی نەماوە.

لەبەردەم دەرگـــایەکی بچووکـــدا، کە پـــێ پلیکـــانەیەک لەودیـــوییەوە دەســـت پـــێ دەکـات و مەگەر خـوا بزانێـت لە کوێـدا کۆتـایی دێـت، دەم وەسـتێنن. دایکـم دوودڵە، هـاوڕێکەم لە گیرفانیـدا پـارچە کـاغەزێکی بچـووک لە شـێوە تکتێکـدا دەردەهێنێـت و دایکـم دڵنیـا دەکـاتەوە، کە خـۆی وەرەقەی بـۆ بریوم.

به تەنیــا ســەرناکەوم.. لەبەر ئەوەنــا هێــزی ســەرکەوتنم تیــا نیــیە، لەبەرئەوەی لە تاریکــایی ســەر پلیکانەکــان تۆقیــوم، کە وەک ڕەشــایی نیوەشــەوێکی زســتان بەســەر پلەکانــدا خــۆی درێــژ کــردووەتەوە. بە یــارمەتیی هەردووکیــان، پــلە بە پــلە ســەر دەکەوم.. مــن هەمیشــە لە چیرۆکــدا بە پلیکــانەدا ســەر دەکەوم، هەرگیــز خــۆمم نەبینیــوە دابــبەزم. ڕەنــگە هــی ئەوە بێــت ڕووداوەکە لە ســەرەوە کۆتــایی دێــت و پێویســت ناکات من زەحمەتی هاتنە خوارەوە بکێشم.

لەســەر کورســیی فەرمانبەرەکــان دا دەنیشــم و چــاوم لێــیە هێشــتا فــایلی ئەمــڕۆ هەڵ نەگیــراوە، کەچــی گەر لە دوورەوە ســەیری بکەیــت، ســەر تویژێــک تەپوتــۆزی گرتــووە، هەمــوو شــتێک لەو مردووخــانەیەدا وا بــوو، قەدەرێکــی کەم پــاش هــاتنە ئەوێــی، تــۆز دەیگــرت، تــۆزێکی زەرد.. کە مــن ئێســتاش نــاوی دەنــێم تــۆزی مــردن.. مــن ئەو شــەوە کە لەوێ هــاتمەوە، دەتــوت لە چــاخێکی زۆر کــۆنەوە ڕێــم هەڵە کــردووە و بە لاڕێیەکــدا ڕێــم کەوتووەتە ئەم سەردەمە.

فــایلەکەم کــردەوە، تەنیــا فــۆڕم و وێــنەی کچێکــی تیــا بــوو، بە خەتێکــی گەورەی نــاخۆش-بەڵام ڕوون- لەســەری نووســیبوو (هانــا هاشــم کەمــال.. خوێنــدکاری قۆنــاغی یەکــی کــۆلێژی پزیشــکیی، لە گەڕانەوەیــدا لە ڕێگــای بەغــدا، بە کارەســاتی ئۆتۆمبێــل گیــانی لەدەســت داوە) لە خــوارەوەی فــۆڕمەکەدا، وەکــو پەراوێزێــک بە جــافێکی ســوور نووســرا بــوو (تێبینــی: ئەمە تەنهــا مــردووە کە تۆمــاری دەکەیــن، لە پــاش دە ســەعات لە مردنــی، هێشــتا هەڵمــی لــێ هەڵ دەســتێت..!!) لە خــوار تــر نــاوی فەرمــانبەرەکە و ئیمزایەکی ئاڵۆزی خۆی کە دەتگوت هێڵکاریی مردنە، جێ هێڵ رابوو.

مــاخۆلانم پــێ کەوت، ئەوە مــن نەبــووم تــا هــاتنەوەی بــاوکم بە بــێ دەنگــی دابنیشــم، ئــاخر بــێ دەنگــی لەو بینــایەدا زۆرتــر ڕەنگــی مەرگــی دەڕشــت. هەســتام بەرە و هــۆڵی تەرمەکــان ڕۆیشــتم، دەزانــم شــەوە و ســەیرکردنی مــردووش بــۆ کەســێکی زارەتــرەک و تۆقیــوی وەکــو مــن، ئەنجــامێکی باشــی

نابێت، بەڵام سەرەڕۆییەکەم پاڵم پێوە دەنێت بچم، (هانا) ببینم. دەرگا ئاسنینەکەی هۆڵەکە دەترازێنم و دڵم هێندە پەلەپەل لێ دەدات، بەئاسانی گوێم لەدەنگێتی.. تەمێکی سپیی قورس، شاڵاو بۆ دەم و لوتم دەهێنێت، تا ئەو کاتە نەمزانی بوو بۆنی مردن، کەسکون ترین بۆنی ئەم گەردوونەیە.

بۆنی شێ و تەڕی دەکەیت..

زۆرتر دەچیتە تاریکییەکە و ئەگەر گوێت لە دەنگی دایکت نەبایە، کە بسمیللای دەکرد، ئەوە دەتوت کە ئەوانت لەگەڵ نەماوە، دوا پلەی پلیکانەکە دەبڕیت، یان ڕاستتر وایە بڵێم دەتبڕێت و خۆت لە هۆڵێکی ساردی تەسکدا دەبینیتەوە.

چەند نەخۆشێکی لەڕ و لاواز لەسەر کورسییە چڵکنەکانی بە بێدەنگی دانیشتوون، تەنها یەکێکیان نەبێت بە هەردوو قاچییەوە چووەتە سەر کورسییەک و بە ئاوازێکی خۆشی فارسی، قورئان دەخوێنێت. ئاگاییم ئەوەندەم کۆمەک پێ دەکات کە هەستی پێ بکەم، جارجار لەنێوان ئایەتێک و ئایەتێکی تردا، شیعرێکی خیام ئەوەندە وەستایانە دا دەنێت، کە کەم کەس دەزانن ئەوە قورئان نییە. دەمەوێت بۆی ڕاست بکەمەوە، وتەکان تا سەر زمانم دێن، بەڵام وەک شتێک زمانم بەسترا بێت، ناتوانم بیانڵێم.

دەرگاکەم کردووەتەوە، گوێم لە دەنگی ڕیکۆدەری پاسەوانی کۆگای دەرمانەکەی ئەوبەرە کە لە ترسی تەنیایی، گوێی لە بێ کەڵک ترین گۆرانیبێژی میللیی شار گرتووە. وەکو ئەوەی بۆ ژووری نوستنی کەسێک بچم، بە ئەسپایی و ڕێزەوە دەرگاکە دا دەخەمەوە و هەنگاو هەڵ دەهێنم. بەبەردەم مردووی یەکەمدا ڕەت دەبم و ناوێرم سەیری بکەم. دەبێت ئەوە بڵێم کە ئەوەندە بەدبەخت بووم، (هانا) دوایەمین تەرم بوو لەو ڕیزبەندییەی بەپێی حروفی ئەبجەدی دایان نابوو. واتە دەبوو هەموو

مردووەکـان تـێ بپەڕێـنم، ئینجـا دەگەیشـتمە ئاسـتی ئەو سـەرچەفە سـپییەی ئەو لەژێریدا بێ باک ڕاکشا بوو.

-چـــــــیــــــــــت دەوێت...؟

دەنگێکـی قـرخن، وەک لە دۆڵێکـی دوورەوە بـانگم بکـات، ڕای چڵەکانـدم. بینـــیم یەکەمـــین تەرمە کە لە کۆنیـــدا ئەوەنـــدە زەرد ببـــوو، دەتـــوت خوێنـدکارێکی ناشـیی پەیکەرسـازی، لە قـوڕی دەسـت کـرد بـۆ مامۆسـتای دروسـت کـردووە. لە شـوێنی خـۆی ڕاسـت بـووەوە، ڕوو لە مـن چـاوەڕێی وەڵام بوو، هیچم بۆ نەوترا.. هیچی چی؟ تۆش بیت هیچت بۆ دەوترێت؟ دەست دەکەیت بە گریان..

ناتوانیـت، نە فرمێسـکێکت بـۆ دەرژێـت و نە نوزەیەکیشـت لێـوە دێـت. دەزانـم چـاوم پـڕ بـووە لە ئـاو، بە شـێوەیەک بە ئەسـتەم لە لێڵـیـیەکەدا ئەو فەراشـە ڕدێـن سـپییەم بـۆ دەبینرێـت کە وەکـو دەرگـاوانی بەهەشـت بێـت، هەموویـان بە تکتەکـانی ناودەسـتیانەوە، چـاوەڕوانی ئامـاژەیەکی ئەون. بە منیشـــەوە کە هەتـــا ئەوکـــاتە لەنێـــوان دایکـــم و ســـکرتێرەکەدا کە قەیرەکچێکـــی غەمگیـــنە، دانیشـــتووم و چـــاوم زەق زەق بـــۆ بەرامـــبەر دەڕوانێت و هیچێکی لـێ نییە خۆمی پێوە بخلافێنم.

مـــن نـــازانم، بەڵام دایکـــم دەڵێـــت شـــوکوور لە هەموویـــان باشـــترم، قەیرەکچەکە نائومێدانە چاوێک لەمن دەکات و لە دایکم دەپرسێت:

- باجی، ئەم کوڕەی تۆ لە چییەوە وای لێ هات؟

ناهێڵێت دایکم دەم هەڵ بێبێتەوە، درێژەی دەداتێ:

- بیرکـردنەوە وای لـێ نەکردبێـت، باشـە.. ئـێمە هەرچیـی نەخۆشـمان هەیە، بیرکردنەوە سەری لـێ شێواندووە.

هەنکەهەنـک و قرخەقرخـی سـنگی هـاوڕێکەم، لەو گفتوگـۆ بـێ تـامەم دەچڕێـت و دەڕوانـم ئەو کـوڕە شـاعیرە، دەسـتی گرتـووە بەو نـاوچەوانە زلەیەوە و فرمێسـک وەکـو شەسـتەبارانی پـایز لە چـاوانییەوە دێـتە خـوارێ. خەریـکە دڵـم تەنـگ دەبێـتەوە، دایکـم قـوڵم دەگرێـت و بەدەم خوێنـدنی

ئایەتەلوکورسییەوە دەمداتە دەست فەڕاشە پیرەکە و ئەو بە سۆزێکی باوکانەوە، دەست دەخاتە سەر شانم و دەربازی ئەودیو دەرگاکەم دەکات.

من لە ژیاندا لە شەڕی زیندووەکان هەڵ دەهاتم، ئێستا ڕیشم بووە بە شەڕی مردووەکانەوە.. زۆرم لە خۆم کرد قسە بکەم، هیچم نەوتبوو کە مردووەکەی تەنیشت ئەویش لەسەر بەستە کاشیی بەندە سپییەکە هەستایەوە و هەمان پرسیاری کردەوە، لە ساتێکی کورتدا کە خۆم و کەسیش نازانێت چەندی خایاند، (هانا) نەبێت، هەموو مردووەکان هەستابوونەوە و لەسەر ئەو زەوییە ساردەی هۆڵە شێدارەکە، ڕوو لە من دەستی یەکتریان گرت بوو، تا بواری دەرباز بوونم بۆ نەهێڵنەوە. بە ئیقاعێکی سەربازی، هەموویان بەیەکەوە قاچیان دەجووڵاند، ڕاست چەپ.. ڕاست چەپ.. تا ئەو دەمەش نەمزانی بوو، کە لە مردندا ڕژێمێک هەیە چاودێریی هەڵسوکەوت و ڕێ ڕۆیشتنی مردووەکان دەکات. ئەوە تەنها سات بوو من لە ژیانمدا ڕقم لە مردن بووبێتەوە، چونکە ناچار بە سیستمێکی دەکردم، کە من بە هەموو تەمەنم لێی ڕام دەکرد.

- دکتۆرە ناهێڵێت کەس لەگەڵ نەخۆشەکانیدا بچێتە ژوورەوە.

کچێکی سپیکەڵەی ناسک بە چاویلکەیەکی چێوە زیوەوە لە پشت مێزێکی ساجی تۆخەوە دانیشتبوو و موتاڵای کتێبێکی ئینگلیزی گەورەی دەکرد، وا ئێستا لەبەرم هەستاوە و فەرمووی دانیشتنم لێ دەکات.. تا ئەوکاتە من چاوەکانم پڕ بە هەردوو کالانەکە کرابوونەوەوە و دەڵێیت دەمەوێت هەرچیی شتی ئەو ژوورەیە، بە چاو قوتی بدەم.

مردووەکان بە سەرو قۆڵی قرتاو و ناوسکی هەڵ دڕاوەوە، بە خوێنێکەوە کە قەتماغەی گرتووە و مەییووە، بەرەو ڕووی من دێن و تا دێت منیش پاشە ویاش لە تەرمەکەی (هانا) نزیک دەبمەوە. وەک هەمیشە پەرجوویەک ڕوودەدات، چیرۆکنووس دروستی نەکردبایە، من لەو هۆڵەدا لە ترسدا بەتەنیا گیانم دەردەچوو. چاو دەنوقێنم و چاو دەکەمەوە،

وەکـو ئەوەی هـیچ ڕووی نەدابێـت، هەمـوو مردووەکـان لە جـێگە ڕەقەکـانی خۆیانـدا ڕاکشـاون و سـەرچەفەکان توانـای داپۆشـینی هەمـوو جەسـتەیانی نییە. نیوە ڕووت و نیوە پۆشتە، بێ دەنگ و سامناک لە جێگەی خۆیان نوسـتوون. درەنـگ تـێ دەگەم ئەوانە هەمـووی خەیـاڵاتی فراوانـی مـن دروستی کردبوون، ئەگینا لەوەتەی دونیا دونیایە، مردوو لە شوێنی خۆی نەجووڵاوە.

جـارێکی تـر ئەو کـچە سـپیکەلەیە کورسـییەکەم بـۆ دەجووڵێنێـت و ئامـاژە دەکـات لەسـەری دابنیشـم، منـیش وەکـو گیانـدارێکی سـرکی کێـوی، هەر دەڕوانـم. دەڵێیـت مـن جـارێکی تـر و لە زەمەنێکـی تـردا ڕێـم کەوتـووەتە ئەم ژوورەوە. بە چـواردەوری خۆمـدا هەڵ دەڕوانـم، لەپـڕدا قاقـا دەتەقـمەوە.. پـێ دەکەنـم.. ئەوەنـدە پـێ دەکەنـم، چـاوم لێـیە ئەویـش لە سـەیرکردنی مـنەوە بەبـێ هـۆ کەوتـووەتە پـێ کەنـین.. دەخەنیـین.. ئەوەنـدە دەخەنیـین تـا چاوی هەردووکمان پڕ دەبێت لە ئاو.

بیـرم دەکەوێـتەوە، لە کتێـبە سـایکۆلۆژییەکاندا بەرچـاوم کەوتـووە چـۆن چارەسەرسـازیی دەروونـی لە ڕێـی خـۆ بە هـاوڕێکردنی نەخۆشـەکەیەوە، کارەکانی خۆی مەیسەر دەکات، پێم وت:

– فەرمـوو دانیشـن.. ببـورن ژوورەکەم کەمێـک تەنـگە، بـۆ شـازادەیەکی ناسکی وەکو ئێوە، دڵنیام هەر هیچ نییە.

زانـیم هەڵەیەکـم کـردووە، نەدەبـوایە بڵـێم تەنـگە. ئـاخر ئەو نەخۆشـانەی تووشـی دڵتەنگـی دەبـن، دەبێـت بیانپارێزیـت لە بەرکەوتنـی وشـەکانی: تەنگ، تەسک، توند و قەپات..

هەڵەکەم ڕاستکردەوە و وتم:

– کەرەم بـکەن و گەورەمـان بـکەن.. هەرچەنـدە دڵنیـام ژوورەکەم بـۆ شـان و شـکۆی ئێـوە، زۆر دڵگیـر نیـیە.. دەی بڵـێم چـی، وا ڕێـک کەوت. تـازە لە دەرەوە هـاتوومەتەوە، خۆشـت دەزانیـت لێـرە لە ڕێکخسـتنی ژووردا، کەس

کار بە دیزاینەر ناکات، بۆیە مەزاجە خراپەکەی من، هەر ئەوەندەی تیا بووە.

گەیشتوومەتە ئاستی تەرمەکەی (هانا).. دەست دەبەم سەرچەفە سپییەکەی لەسەر ڕا بمالم، وەکو لە ڕاپۆرتی نێو فۆرمەکەدا نووسرابوو، ئاوا بوو؛ هێشتا هەڵمی لێ هەڵ دەستا. هەڵمێکی تەنکی فێنکی بۆن خۆش کە تژی بوو لە بۆنی جەستەی خۆی، سەرم شۆڕ کردەوە بەسەریدا، چاوم قەتیس کرد، ڕاستە و ڕاست ئەو شتەی لە فیلمە ترسناکەکاندا ڕوو دەدات، ڕووی دا. بە خێرایی چاوی کردەوە و بە ئەسپایی وتی:

- یارمەتیم بدە...

تا ئەو کاتەش لە منی نەدەڕوانی، دەتوت بەو تارماییە دەڵێت کە لە هەڵمی جەستەی بلورینی خۆیەوە دروست بووە و ئێستا ئەویش لە بنمیچی هۆڵەکەدا گیری خواردووە. نەترسام، ئەوە یەکەمین جارم بوو لە ژیانمدا نەترسم، ئاخر من بەر لە تۆزێک، هەموو تخوبەکانی تۆقینم بڕیبوو، تازە ترس لە فەرهەنگی مندا مانایەکی نەدەدا، وتم:

- دەتوانم چیت بۆ بکەم؟

بەرامبەرم وەستابوو، هێشتا ئاسەواری پێکەنینەکەی لە ڕوودا مابوو، بە مەکرێکەوە کەمێک ناوچەوانی گرژ کردو وتی:

- دەستتان خۆش، هەر وا دەبێت.. بەڵام لە هەڵبژاردنی ڕەنگی بۆیاخەکەدا، کە کاکاوییەکی تێرە، وا دەردەکەوێت دەروونی جەنابتان کەمتر لە هی ئێمە ئاڵۆز نەبێت. ڕاڕایی و دوودڵی و بڕوابەخۆنەکردنی تیا دەخوێنمەوە، نازانم.. لەوانەشە وا نەبێت.

ئەو دەیویست بۆ بەغدا بگەڕێتەوە.. بەردەوام دەیوت موحازەرەم هەیە. کۆرسێک دواکەوتووم یارمەتیم بدە با نەکەوم. ئەوەی لە دەستم هات، کردم. لەو هۆڵە شێدارە سامناکە دەربازم کرد و لە ژووری فەرمانبەرەکاندا بەیەکەوە دانیشتین. چاکەتە تەپوتۆزاوییەکەی خۆمم دا

بـووبێ، ئاگـام لـێ بـوو هێشـتا هەر هەڵ دەلەرزی، زۆر کەم دەدوا، منـیش هیچـی وام نەبـوو لەگەڵیـدا باسـی بـکەم.. لە ژیانیشـمدا سـەختترین گفتوگـۆم لەگەڵ ئەو کەسـانەدا بـوو کە پێشـتر هـیچ یادگـارییەکەم لەگەڵیانـدا نەبـووە، بەڵام وام مەزەنـدە دەکـرد لە شـوێنێکی دوور و لە ڕۆژێکـی دووری تـردا، ئەم دانیشـتنەی مـن و هانـا دەبێـتە یادگـارییەک، کە دەرگای قسەکردنێکی زۆرمان لەبارەی یەکترییەوە بۆ دەکاتەوە.

وەکـو پەردەیەکـی شـانۆییمان نمـایش کردبێـت، بـۆ سـاتێک هەردووکمـان بـێ دەنـگ بـووین، دیـار بـوو شـوێن گۆڕکێمـان بە جێگەکـانی خۆمـان کردبـوو، وابـزانم لەگەڵ پێـزانینەکەی منـدا، ئەویـش هەسـتی بەو منـداڵکارییەی خـۆی کرد، بۆیە کەوتە خۆی و وتی:

- وا بزانم ئێوە میوان بوون.. فەرموون بزانم چیتانە.

دەیزانـی کە لەو مـاوە کـورتەی پێشـوودا، زۆر شـتی درکانـدووە کە نەدەبـا بـی درکانـدبایە، ئـادابی پرسـیارکردنەکەی گۆڕابـوو، تـازە بـۆ ئەو درەنـگ بـوو بتوانێـت وەکـو دکتـۆرەیەکی دەروونـی لەگەڵ منـدا بئاخافێـت. ئەو دەیویسـت هەرچیـی زووتـرە، لەکـۆڵ خـۆیم بکـاتەوە. لەو بیرکـردنەوانەدا بـووم، کە چـاوم چـووە سـەر ئەو پـارچە سـاجە ڕەشـەی، بە شـێوەیەکی ئەنـدازیارییانە نـاوی خـۆی لەسـەر هەڵکەنرابـوو: (د. هنـاء هیشـام کامیـل)، ڕاچڵەکـیم. زارم داچـڕی و چـاوم زەق زەق کـردەوە، خـۆم دەمزانـی هەناسـەم تێـدا نەمـاوە.. زۆرجـار مـرۆڤ هەسـت دەکـات کە مـردووە و تەوابـووە، کەچـی کە دواتـر وا دەرناچێـت، ئەوەنـدە پێـی دڵتەنـگ دەبێـت، کە جیـاوازییەکی وای نیـیە لەگەڵ دڵتەنـگ بـوون بە مـردن. مـن هەر زوو و بەر لەم نەخۆشـییەش، وا بـووم. وتـوومە شـەڕ لەگەڵ مردنـدا بەوە ناکرێـت کە ئەو وەکـو کاسـپەر سـەد تیـری ئـێمە بەناویـدا تـێ بپەڕێـت و هیچـی لـێ نەکات، بەڵام تەنیا تیرێکی ئەو، ئێمە لە شوێنی خۆی لار بکاتەوە.

بەڕێـم کـرد.. تاکسـییەکم لەو شـەقامە چـۆڵەی پـێش فەرمـانگەکە پەیـدا کـرد و دەسـتەودامەنی شـۆفێرەکە بـووم، کە ئەم خوشـکەم بـۆ بگەیەنێـتەوە

ماڵەوە. کوڕێکی گەنجی پڕ لە ژیان بوو، بە چاویدا مرۆڤێکی ئارام و لە پیاو خراپ نەدەچوو. من ئەو شۆفێرەش بە تاوانبارێکی تر دەزانم، ئەگەر ئەو ئەوشەوە (هانا)ی نەگەیاندایەتەوە ماڵەوە، ئێستا دوای ئەو هەموو ساڵە، من تووشی ئەم کارەساتە نەدەبووم.. کە گەڕامەوە مردووخانەکە، باوکم هاتبووەوە، تورە دیاربوو، پێیوتم:

- باوکەکەم نەدەبوو ئێرەت بەجێ بهێشتایە..

من بەو دەمەوەرییەی خۆم، وەڵامێکی حازر بەدەستم دایەوە:

- باوکە ئێرە مردووی لێیە، قابیلە خەڵک چی لە مردوو دەکات؟!

ئەفسەری لێکۆڵینەوەکەش هەر وای وتبوو، وتبووی قابیلە خەڵک مردووی بۆ چییە؟ بەڵام بەوەدا کە کچێکی جحێڵ و ناسک بوو، هەموویان غایلەی خراپیان دەبردەوە سەر باوکم کە وەکو تاکە پاسەوانی ئەو شەوەی مردووخانەکە، مابووەوە.. من هیچم نەدرکاند، وتم ئاگام لە هیچ نییە. باوکمیان بە تاوانی کەمتەرخەمی بەرامبەر ئەرکەکەی و فڕاندنی تەرمی کچێک بۆ شوێنێکی نادیار، بە چەند ساڵێک حوکم دا. من بە ئێستاشەوە ئەمەم لەلای کەس باس نەکردووە.

نەمدەویست هیچیشی بۆ باس بکەم، ئەگەر دکتۆرە هناء زۆری لێ نەکردمایە، لەسەر کورسییە چەرمەکە هەستام و وتم:

- خانم حەزم نەدەکرد لێرە بمبینیتەوە.. من ئەو کوڕێژکەیەم کە ساڵی (١٩٨٩) ئێوەم لە مەیتخانەی سلێمانی ڕزگار کرد و بەو هۆیەشەوە باوکم چەند ساڵێ زیندانی و من تەمەنێک ئیشی قورسم بۆ خۆم بڕییەوە.. لەو هەموو زەمان گۆڕینەدا، باوکم ئامادە نەبوو لە زیندان بێتە دەرەوە، ئەو ڕۆژانەی ڕاپەڕین ڕوویان دا، یان زیندانەکان دەشکێنران، باوکم دەهاتەوە ماڵەوە و دواتر دوای گەڕانەوەی حکومەتێکی نوێ، باوکم دەچووە بەردەم زیندانەکە و داوای دەکرد زیندانیی بکەنەوە.

جەنابی دکتۆرە..

باوکی ئێمە ئەوەندە بیری لە دیارنەمانی تەرمی ئێوە کردبووەوە، کە لە دواجاردا خۆشی ئەو بڕوایەی لەلا دروست ببوو کە هەر خۆی تەرمەکەی جوڵاندووە و بردوویەتی بۆ شوێنێک، کە ئێستا بیری نەماوە. دکتۆرە گیان، باوکم هەتا مرد، هەستی بە مۆتەکەی ئەو گوناهە گەورەیە دەکرد لەسەر سنگی.. ئێستاش دوای ئەو هەموو ساڵە، خۆشحاڵم کە ساغ و سەلامەت لەم شارەدا دەتبینم خزمەت دەکەیت.

من قسەم دەکرد و دکتۆرە هناء دەگریا، بەدەم هەنسک هەڵدانەوە دەیوت:

- چاک لەبیرمە، ئەو مەیتخانەیەی فەرمانبەرەکان ناوی منیان بە هەڵە لەسەر فۆڕمەکە نووسیبوو. (١٦) ساڵە من بیر لە تۆ دەکەمەوە.. من دونیا بە شوێن تۆدا گەڕام، ئەرز نەما پێی تێ نەخەم، وڵات نەما سۆراخی تۆی تیا نەکەم.. تۆ ئەم هەموو ساڵە لە کوێ بوویت؟!

منیش هەناسەی قووڵم دەدایەوە و دەموت:

- دکتۆرە گیان، کچە کاڵەکەی من، هەر لەم شارەدا بووم، لەم شارە.. لەڕۆخی فەرامۆشیدا.

ئەو دەستی پێ کردەوە، ئەم جارەیان هێندە شاعیرانە دەدوا، کە من دوودڵ بووم لەوەی لەبەردەم دکتۆرەیەکی دەروونیدام، یان لەپێش ئەو کچە شاعیرەیەی کە لایەکی نووسەر و سیاسییەکانی وڵات بۆی حەیران ببوون.

نەمویست گوێم لەو هەموو سۆزە ڕژاو و پەرتە بێت کە ئەو بە چواردەوری خۆیدا هەڵی دەڕشت، من هەمیشە وا بووم، لە خوو پێوەگرتن و پیاهەڵدانی کچان هەڵاتووم.. ئێستاش دەرگاکەم کردووەتەوە و دایکم و هاوڕێ شاعیرەکەم بە پرتاو خۆیان هاویشتووەتە ژوورێ. من وامزانی لەوێ ڕۆیشتووم، هەڵبەتە دکتۆرە هناء-یش هەر وا تێگەیشتبوو، من چوومەتە دەرەوە.. هەر بە چاوی تەڕ و بەدەم هەنسک هەڵدانەوە، ڕووی کردە دایکم و وتی:

- بـۆ زوو نەتـــان هێنـــاوە؟!.. لێـــی پـــیس کـــردووە.. بـــڕۆن بـــی خەوێنـــنن، کارەبای لێ بدەم.

دەرگـــاکەم کـــردەوەو لە ڕووی ستایشـــەوە دەســـتی چەپـــم بەرز دەکەمەوە و وا بزانم دەڵێم:

- سوپاس.. خانم گیان.

٢٠٠٦

*** (مـــردووەوان) وشـــەیەکە خـــۆم دام تاشـــیووە، نزیکییەکـــی زۆری هەیە لە وشـــەی (زێـــوان)ەوە کە بە مانـــای پاســـەوانی گۆڕســـتان دێـــت، بەڵام ئەو وشەیەی من، بە مانای پاسەوانی تەرم دێت.**

# سێدارەی زستان

ساڵی ١٩٩٣ لە سێدارە درام.. لەچەقی شاردا لە سێدارە درام.

بۆ تۆ وا باشترە من نەناسیت.. من خۆم هیچ نکوڵییەکم لە خۆناساندن نییە، بەخاتری تۆ دەڵێم، دەزانم هەر ئەوەندەی منت ناسی ژیانت دەشێوێ.. دەشزانم جارجارە ئادەمیزاد حەز لەو شێوانەی ژیانی خۆی دەکات، بەڵام هەرگیز بەڕاستی ئەوەی ناوێت.. ئێمە خوخدەمان بەژیانی خۆمانەوە گرتووە، ڕێ نادەین کەس پێ بخاتە ئەو حەرەمەوە، ژیان یانی نەزم.. منیش دەمزانی یانی نەزم، لێ خۆم ویستم دەستکاری ئەم نەزمە بکەم.. من پیاوی نهێنیەکانم، پیاوێکی لە سێدارە دراو.

حەزکردن لە کچۆڵەیەکی خوێندکاری ناوەندیی، عەسرێکی تاریکی زستان لە شارۆچکە قەبزەکەی ئێمە لە نزیک چیای (شێنێ) لە سنوری ئێران، خوێنی دنیای بەدوای خۆی دا هێنا.. تازە تاوێکی بارێزە خۆشی کردبووەوە کە لە سەدرییەکی ڕەساسی و کراسێکی سپی دا بە بەردەمم دا تێپەڕی.. ئیتر هەموو شتەکان لێرەوە دەستیان پێ کرد.. هەمیشە ڕووداوەکان لە تێپەڕینی کچێکەوە دەست پێ دەکەن. هەستی سەرەتای من جیاواز بوو لە هەموو عاشقێکی تر؛ من کە ئەو عەسرە ئەو کچە بە لەنجەیەک؛ کە هەر کچان خۆیان دەزانن چۆن لە ساتگەلێکی ئاوهادا بیکەن، بەبەردەمم دا تێپەڕی.. هەستم کرد قورس بووم، مینا قوتدانی بەردێکی سەنگین.. نەمدەتوانی لەجێی خۆم جوڵەبکەم.

ئەگەر مــن عەشــقی ئەو خــانمە هەســتی قوتــدانی ئەو بەردەی نەداباما، ڕۆژێــک لە ڕۆژان ســەری خــۆمم هەڵ دەگــرت و تفێکــی خەســتم لەم نیشــتیمانە دەکــرد و ئاوهــا خــۆم زایە نەدەکــرد، بەڵام بە جــۆرێ قــورس بــووم کە لەم خــاکە هەڵ نە دەپچــڕام.. شــەوی ئەو عەســرە لەئــانی بەڕێکردنــی میــوان دا زانــیم کە نــاتوانم هەستم، لەو شــەوەوە بەردەوام مــن پێویســتم بە دوو کەس هەبــوو تــا دەســت بــدەنە بــاڵم و هەڵمســتێنن. خــۆم لەو حــاڵەتە ناسروشــتییەی خــۆم ســەرم ســوڕما بــوو، مــن بیســتبووم کە ئــادەمیزاد عاشــق دەبــێ کێشــی لەدەســت دەدات و بەجــۆرێ ســووک دەبــێ؛ وەک پــوش و پەڵاشــێک دەچێــتە گــۆرانییەوە و لێــرە و لەوێ لە کــوچە و کۆڵانی یاردا بە ئاسانی بــا دەیفڕێنێ.

ئەبــێ ببــورن مــن زمــانی وەســفم ئــاوا کــورتە، هەمیشــە کە ئیشــم کەوتبێــتە ئەم زارە پــوچەم ئــاوا شــەرمندەی کــردووم، مــن نــازانم چــۆن ئــازاری ئەو عەشــقەتان بــۆ بگێــڕمەوە، چــونکە گێــڕانەوەی ئــازار شــتێکە و چەشــتنی ئــازار خــۆی شــتێکی تــر.. وشــەکان ترســنۆکن، هەمــوو وشــەی دونیــا نــاتوانێ ســوتانی پەنــجەیەک بگێــڕێتەوە؛ ئــاگرێکی خــۆش، شــین و دڕ لەســەر پەنــجەت ڕاگیــراوە.. پێســتی یەکەمــت گــورج و تــرپ تــرپ ئــازار دەگــوازێتەوە.. ئەو دەســوتێ و گڵــۆپ دەکــات و دەتەقــێ و ئــازارت چــووە بــۆ عەرشــی عەزیــم.. گۆشــتەکەت دەســوتێ و چینــێ ئــازاری چــڕ پەیتــا پەیتــا بە ڕۆحتــا هەڵ دەشــاخێ.. بــۆچرپوکێکی تیــژ و بــۆگەن هەڵ دەماســێتە کــونە لووتەکانــت.. گــڕی شــین ســرەوتی نیــیە و هەردەگــرێ و دەگــڕێ و تــۆ لەنــاوەوە دونیــای خــۆت پڕکــردووە لە زریــکە.. بەرچــاوت ڕەش دەبــێ.. وا دەزانی ئێستا هەموو شتێک تەواو دەبێ و دنیا کش و مات..

گــڕ هەر دەتســوتێنێ و تــۆ هەر دەقریشــکێنی و دڵــت کەف دەکــا و ئــازار هەردێ و هەردێ و هەر...... ئەوە پەنــجەی تــۆ نەبــوو دەســوتا، نــــا.. ئەوە ئاگرێــک بــوو مــن لەســەر ئەم کــاغەزە کردبــوومەوە.. ئەمە ئــازارێکی درۆیــنە بــوو، ئــازارێکی ســووک و چــرووک.. بــۆ ئەوەی لە ئــازار خــۆی تــێ

بگەیت نوسین هیچ کۆمەکێکت ناکات، هەستە برۆ دەستت لەسەر ئەو پشکۆیە ڕاگرە.

شەیدایی من بۆ ئەو کچەی عەسرێکی بارانـاوی زستان بە بەردەمم دا تێپەڕی، دروست شتێک بوو وەک دەست ڕاگرتن لەسە ئەو پشکۆیە، من ڕۆژ بە ڕوژ دەسوتام و دەبوومە خۆڵەمێش و دیسان بۆ تەواوکردنی ئەم سوختەییە دروست دەبوومەوە.. لەیادم کرد لە سەرەتا دا پێتان بڵێم من کوڕی یەک لەخێڵە گەورە و درەکانی ناوچەکەم و بینینی من بەو لاوازی و نەحیفییەم شەرمێکی گەورە بوو لە پێش دا بۆ خۆم و دوایش و بۆ ئەوان.. وا بزانم یەکەم نیشانەی عاشقبوون ئەوەیە مرۆڤ ڕقی لە ئاوێنە دەبێتەوە.. نا لەبەر ئەوەی جوانێکی بینیوزە و ئیتر شەرم لە ڕوانینی ڕوخساری خۆی دەکات، بەڵکو لەبەر ئەوەی لەخۆی دەترسێ.. ئێستا لەم دونیایەی ترەوە هێندە خەیاڵم پەرتە بیرم چۆتەوە دەبی بە چیی..؟ بەڵام دڵنیام ئادەمیزاد کە عاشق دەبێ لە ئادەمیزادەوە دەبێ بەشتێکی تر.. من بیووم بەو شتە.

بەیانییەکی خۆرەتاوی بەهار دەسپێکی شێواندنی هەموو شتێک بوو، من لەوساتەوە تا ئێستاش کە لە ژیانێکی تردام ڕقم لە بەهارە، سەعات هەشت و نیوی بەیانی دەستەیەک لە کوڕوکاڵی گەڕەک لەسەرم خڕبوونەوە، کەسیان نەچووبوون بۆکار.. هاتبوون بە من بڵێن کە کچی زستان (ئەوە ناوێک بوو من بۆ خانمی خوێندکارم داتاشی بوو) ڕەدووی عەبوسترین و ناچیزترین کوڕی شارۆچکەکە کەوتووە.

ئەو ڕۆژانە سەرەتای شێتێتی من بوو.. هەر بەڕاستی دابوومە کێو.. لەوێ لەدانەکێوی قەیس و فەرهادیش گەیشتم.. ئەو ڕۆژانە لە ناو ئەو جەنجاڵییەی خۆمدا فریا کەوتم بیر لە پەیوەندی نێوان فیراق و کۆساران بکەمەوە.. ئەو چەند مانگە لە پلەیەکدا بووم کە بیرمە یەک دووجار سەرم بۆ ئاسمان بەرزکردەوەو گوتم "لە هەموو جێگایەک جێت هێشتبێتم لێرا جێم مەهێڵە.. بەرگە ناگرم.. خۆشت دەزانی..!"

ئەو ڕۆژانەی منی تێدا کرام بە دارا خەڵک برسی بوو، فرسەتێکت گەورەی یەکتر خواردن بوو، لە هەموو لاوە سنوری ئەم شارە وەک ئەژدیهایەکی زەبەلاح زاری دادەچڕی و بروسکەی دەدا.. شەڕبوو.. یەک یەکی دەکوشت و پێویستی بە زەحمەتی ئەوە نەبوو لەخۆی بپرسێ (بۆ..!) ئەو ڕۆژگارە خەڵکی ئەم شارە بە نان.. بە ئاو.. بە ئازادی نەدەژیا.. نا.. بەکۆمەکی هێزێکی تر دەیتوانی بەردەوام بێت؛ هێزی ئەفەرۆز کردن، توانایەک کە من لێی مەحروم بووم.. لە پێشی پێشەوە ئەو دوو پیتە پچووکەیان فەرامۆشکرد بوو: بۆ..؟

کەس نەیپرسی بۆ وا لە من دەکەن..؟ ل ەناوەڕاستی مەیدانەکەیا لەسەر قەڵاچۆکێکی قوت و خشپیلە ڕایان گرتم.. من لێرەش پێویستم بە دوو کەس بوو تا بەرزم بکەنەوە بۆ سەر ئەو تەپڵەکەی کە دەبوو قاچم بخەمە سەری و دوایش هەر ئەو دوو برادەرە زەحمەتی شەق هەڵدانیان لە تەپڵەکەکەی ژێر پێم گرتە ئەستۆ، کە لەسەرەوە وەستاندیانم تا هەدەری چاو عەشامات ڕەشی دەکردوە.. سەری بۆشی ئینسان بە دوو هەڵماتی واقەوە مەوجی ئەداو ئەهاتەوە یەک.. بۆ یەک سات.. ساتێکی کورت.. پێکەنینم هات.. ئەوە خدێی هەمیشەی خۆم بوو؛ لەو جێگایانەی کەس خەیاڵی بۆ ناجۆرییەکی وا نەدەچوو، من دەمکرد. ئێستاش نازانم بەچیی پێکەنیم، بەڵام دەزانم پێکەنینەکەم وەختەبوو ببێ بە قاقا و ئەگەر نەمگرتبایەوە ئەوە دەبووە بێ حورمەتییەکی گەورە لە ئانێکی وادا ئادەمیزاد بە مەرگی خۆی بیکات..

ئەو هەموو خوێنەی پازدە ساڵ لەمەوپێش لەم وڵاتەدا ڕژا، بەتەنیا من هۆکاری نەبووم! لە ڕاستیدا هیچ جەنگێکی سەر ئەم هەسارەیە بەبێ دەستی ژن دەستی پێنەکردووە.. وابزانم جارێک لەسفری تەکوینی تەورات دا بەرچاوم کەوتووە؛ کە خودا ژن و دۆزەخی لەیەک ڕۆژدا دروست کردووە.. دۆزەخی ئەم نیشتیمانە قەبزەی منیش کچێک

دایگیرساند.. ئێستا کێ بۆ ئەوە دەچێ یەکەم پزیسکی ئەم ئاگرە، کچێک لە شارۆچکەیەکی ئەو بناری سەرسنورەوە هاویشتبێتی..
دەزانم دەبێ رێز لە کاتتان بگرم و ئەوەندە عەشقی مەلولی خۆم نەگێرمەوە، عەشقێک کە ملی باریکی منی برد بۆ ئاسمان.. شەوێکی کۆتایی ئەو بەهارە شوومە، کاغەزێکم لە درزی دەرگای مالّی کچەوە خستە ئەو دیوەوە و بەناوی هەموو خەڵکی شارۆچکەکەوە داوامکرد بوو: (ئەگەر رەدوو کەوتنی کچەکەتان بە لەکەیەک دەزانن بەسەر خانەوادەکەتانەوە، ئەوا کچەکەتان بدۆزنەوە و بیهێننەوە.. ئەگەریش نا ئەوە لەکەیەکە بۆ سەر شەرەفی هەمووەمان و فەرموون ئەم شارۆچکەیە چۆڵ بکەن و ئەم بێ شەرەفییەتان لەگەڵ خۆتان ببەن بۆ جەهەننەم).
من..! ئاهـ.. لەزەینی پەرتی من..!!
بیرم چوو پێشتر پێتان بڵێم برایەکی کچەی زستان لەو شارەی منی لێ لە سێدارە درام، ئەفسەرێکی بالای دەزگایەکی زەبەلاحی ئەمنی بوو، بەوەدا بواری پسپۆرایەتی ئەوان "دۆزینەوەی مەترسی و ئەوانەی دەبنە جێی مەترسی بەسە هاوولاتیانی ئازیزەوە" بوو، دۆزینەوەی من لە خواردنەوەی پەرداخێک ئاو ئاسانتر بوو.. دیسان دەمەوێ کاتتان نەگرم و باسی حەشاردان و سووکایەتی و درەندەترین ئەشکەنجە رۆحی و جەستەییەکانی خۆمتان بۆ نەکەم، کە من تا ئێستا لە دونیاکەی تریش نەمبینیوووە.. بەلام ناتوانم باز بدەم بەسەر ئەو چاوپێکەوتنە تەلەفزیۆنییەی تێیدا من وەک تەلبەرو دز و جەردەی "سامانە نیشتیمانییەکانی ولات" هاتمە ناساندن و هاورێیان درێغیان نەکرد کە بەدەنگی بێژەرێکی گڕ و گەمژە بشلێن "دەستیان گرتووە بەسەر چەندین بەلگەنامەدا کە دەیسەلمێنێ من سەرۆکی گرووپێکی سیخورێم و کار بۆ بەرژەوەندی ولاتێکی دراوسێ دەکەم" بەم تۆمەتە قەبانە کە من قاقام پێیان دەهات، بێ دادگایی لە ناوەراستی مانگی شەشی سالّی ١٩٩٣ بە بەرچاوی خواو خەڵکەوە منیان لە ناوەراستی شاردا لە سێدارە دا.

خێڵــی ئــێمە پێشــتر زۆریــان هەوڵــدا لەو دەزگــا زەبەلاحە ئەمنیــیەم ڕزگــار بــکەن. بەڵام بەوەدا تەونەکە وا چنــرا بــوو کە مــن تەنیــا ڕێــگەی چــوونە ژوورەوەم هەبــێ و تەواو.. هەوڵەکــان بــۆ هێنــانە دەرەوەی مــن لەوە بــێ ئەنجام تــر بــوو لێرەدا بۆتــان بگێڕمەوە.. نەفرەت و تــوڕەیی خەڵکــی گەمژە نەیهێشــــت مــــن ســــێ ڕۆژ لەو دارە بکـــــرێمەوە، پـــاش ئەو وادەیە و بە بــردنەوەی تەرمەکەی مــن بــۆ شــارۆچکەکەی خۆمــان، لەمەراســیمی پێشــوازی جەنــازەی مەزلــومی کوڕەکەیــان و تــوڕەیی کــوڕانی خێڵــی ئــێمە و هەڵکوتــانە ســەر مــاڵی کــچەی زســتان.. یەکەمــین تەقەی شــەڕی نــاوخۆ دەســتی پــێ کرد.

٢٠١٠

# گەڕان بەدوای دایکمدا

دواجار بڕیم.

هەرچەنــدە دڵنیــا نــیم، بەڵام جــگە لە خــۆم، ئەم شــارەش بەرپرســیارە لە تەواوی ئەو شــتانەی ڕوویــان دا.. مــن هــیچ لێــی پەشــیمان نــیم، هەر لە زمــان پــژانمەوە ئەو قســەیەم لەســەر دەم بــوو، "پەشــیمان نــیم، پەشــیمان نــابم." هەر جــارێکیش وام دەوت، ســوور دەمزانــی درۆ دەکەم. وەلــێ ئێســتاش نەمزانــی بــۆ نەمتــوانی بــاوەڕ بەوە بهێــنم، کە هەمــوو شکســتەکانی مــن خەیــاڵێکی ئەوی لە پشــتەوە بــوو، ڕەنــگە ئەوەش پەیوەنــدیی بەو شــارەوە بووبێــت کە مــن زینــدەگییەکی دۆزەخییــانە تێیــدا ژیــام، شــارێک بــێ مەنــهەج تــرین شــاری دونیــا بــوو، لێــوان لێــو بــوو لە زبــڵ و پــڕ لەو گەنجــانەی چاویــان بەدوو بــڕۆوە، لە جێــی ئەوەی لە شــوێنی خۆیانــدا بــن، بە کــڵاوەی ئەژنۆیــانەوە بــوون. هەربــۆیە ڕۆژێــک لە ڕۆژان کەســیان نــاوکی خــۆی نەدی بوو، بەرزترین خاڵی بینینیان، لە کەمەریان تێ نە دەپەڕی.

دەبێــت ئەوە بڵــێم: ئەو ڕۆژانە لەو بــاوەڕەدا بــووم، کە ئاســودەیی لە بڕینــدایە.. بــڕین.. بڕینــی پــارچەیەک لە جەســتەی خــۆت..! قســەی ئێســتام نەبــوو، مــن لە منــداڵییەوە دەمــوت: دەیبــڕم. ئەم خولیــا شــێتانەیەی مــن لە خەوێــکەوە چەکەرەی کــرد؛ منــداڵ بــووم، شــەوێکیان پیــاوێکی خــڕپلانەی ســەیر هــاتە خەومەوە، ئەو پیــاوە ملــی نەبــوو، ســەری ڕێــک وەکــو ئەو دەســکەلایە وابــوو کە هەمــوو نیوەڕوانێــک لە کــۆڵان جــوانترین یــاریم پــێ

دەکـرد. دوو لوقمەقـازیی گرتبـوو بەدەسـتە کـورت و خڕەکـانییەوە و دای بە مـن، وەختێـک لوقمەقازییەکـانم دەخـوارد، دەسـتێکی بـردە نێـوان هەردوو قـاچمەوە و بەرقەوە تونـد گرتـی، مـن شـەرمم دەکـرد و ئەو دەیـوت: "ئەگەر دەتەوێـت هەمـوو هەڵماتەکـانی گەڕەک ببەیـتەوە، بیبـڕە.. ئەم شـتە دێـژە ببـڕە." منـداڵانە پرسـیم: "ئەی مـامە بە چـی میـز بـکەم؟" پیـاوەکە هەناسەسـاردانە نیگـایەکی لـێ کـردم و وتـی: "دە کەوایە مەیبـڕە، هەر بمیزێنە."

هەر بەڕاسـتی نـاو جـێگەکەم تەڕ کـرد بـوو.. ئەو بەیـانییە مـاڵەوە هیچیـان نەوت، بـۆ شـەوی دواتـریش بـێ ئەوەی خەو ببیـنمەوە، میـزم کـردەوە بە خۆمـدا، شـەوی دوای ئەوەش هەروا.. چ قەدەرێکـی بەد بـوو بە مـنەوە نووسـا.. ئاهـ . سـاڵانێکی زۆر ئەم میـز بە خـۆداکردنەم بەردەوام بـوو، تـا شـەوێک گۆبەنـدێکی تـرم بەسـەر نەهـات، ئەم لافـاوی میـزە نەوەسـتا.. سـەرچەفە سـپییەکەم دابـوو بە قاچمـدا و چـاوم بڕیبـووە بنمیچـی ژوورەکەمـان و بیـرم لەو دەکـردەوە، لەو کـچە کـاڵەی خۆشـم دەویسـت. بەئەسـپایە کێلـونی دەرگـاکە تـرازا، وەکـو پیشـەی هەمـوو شـەوانی خـۆی، دەچـوو بـۆ دەسـتنوێژ هەڵ گـرتن، وام مەزەن کـرد بەنیـازی شـەونوێژ بێـت.. ژوورەکە ئەوەنـدە تاریـک بـوو، تارمـاییەکەیم بە ئاسـتەم بـۆ دەبینـرا، نزیـک بـووەوە لەو ڕوونـاکییەی مانگەشـەو لە پەنـجەرەکەوە بەزۆر دەینـاردە ژووری، سـنگە هەڵ تۆقیـوەکەیم بەڕووتـی بینـی، دەبریقـایەوە. دایکـم بـوو، زۆر بەو دەچـوو.. گومـانم کـرد "ئەوە دایـکە ئیمانـدارەکەی مـن نیـیە.." پـێ بەپـێ هـاتە پێشـەوە و بەسـەرمەوە وەسـتا، قەدەرێـک ئەو کشـومات و منـیش چـاوە زەقەکـانم دەرتـۆقی بـوون.. هێـدی هێدی دانەویـیەوە، لێـوە باریکەکـانی خسـتە سـەر لـچ و لێـوە گۆشـتنەکەی مـن. لێـوە لەرزەم پـێ کەوت بـوو، ئەو لەسـەرخۆ مـاچی دەکـردم و مـن پەشـۆکاوانە دەترسـام. ئەو بـوو، زۆر بە دایکـم دەچـوو. دووبـارەبوونەوەی هەمـوو شـەوێکی ئەم چیرۆکە، بەتەواوی منی یەکلایی کردەوە و بڕیاری بڕینیم دا.

ئەوە نـوقڵانەی بەسـەرهاتێکی ڕەش بـوو، کە لەودیـو مێـزی کافتریـایەکەوە عەسـرێک پێـی وتـم: "لەوانەیە بە یەکێـک لە ماناکـان، عەشـق گەڕان بێـت بەدوای دایکـی خۆتـدا." ئەو وەخـتەی ئەو ئەمەی دەوت، مـن ڕەشـاوێکم بە بـاران بـاران، ئـارەق دەر دەکـرد. کچێـک بـوو سـادە دەدوا، بەڵام هەمـوو قسـەکانی زیـاتر لە مانایەکیـان هەبـوو، کێشـەکەی مـن ئەوە بـوو تەنهـا لە مانایەکیـان دەگەیشـتم و بەردەوام ئەوانیتـر پەرتیـان دەکـردم. لە ڕۆژانـی سـەرەتادا، مـن ئەو لێکچـوونەی ئەوم لەگەڵ دایکـم بەدیـی نەکردبـوو، یـان هێزێکـی نادیـار نەی دەهێشـت کە مـن ئەو حەقـیقەتە بـزانم، کە ئەو و دایکـم هەر یەکێـک بـوون. نـا مـن بـاش دەمزانـی ئەو ئەنـدامە نەعلەتیـیەم، منـی خسـتووەتە وەهـا گەرداوێـکەوە، تەنهـا هەوڵـیش بـۆ پـاک بـوونەوەم، بڕینێتی.. بڕین لە بنەوە.

ئـاویەری چاوەڕەشـەکانی وێنەیەکیـان بـۆ دروسـت دەکـرد، کە مـن ئەو وێـنەیەم تەنهـا لە ئەلبـومی چاوەکـانی دایکمـدا دەبینـی.. تەنکیـی لێوەکـانی ڕێـک بە و لێـوانەی دایکـم دەچـوو، کە زۆر کەم بـۆ پێکەنینێکـی کـورت لە یەکـی دەتـرازن. ڕاسـتییەکەی مـن ئەوکـاتە گومـانم کـرد، دایکـمە. کە مەمـکە گەورەکـانیم بینـی و بـێ ڕووخسـەت، پرمـدانێ و مـژیمن، کەچـی بە هەر پێـنج پەنـجەکەی، سـەری بـردمە دواوە و گلەیـی ئـامێزانە و کەمێـک بە مەکـرەوە وتـی: "هەمـوو شـتێک کـاتی خـۆی هەیە." دایکیشـم دەگێـڕێتەوە، کە مـن زۆر شـەیدای مەمـکە گەورەکـانی ئەو بـووم و بە بەرچـاوی خـزم و خوێـوە، هەردوو چـنگم خسـتووەتە یەخەی و مەمکـیم دەرهێنـاوە بـۆ مـژین، وەلـێ دایکـم بە چەپۆکێـک دووری خسـتوومەتەوە و هەر وەکـو ئەو پێـی وتووم: "ئان و ساتی هیچ شتێک نازانیت."

تـێ نـاگەم مـن خـۆم ترسـنۆک بووم، یـان بەڕاسـتی قسـەی ئەو مەحشـەرگەلە ترسـاند بـوومی؛ ئەو پیـاوە ورگ زلەی لە قـاوەگرتنەوە و دەسـت خوێنـدنەوەدا، بەختیـاریی بـۆ خەڵـک دەدۆزیـیەوە، شـەوێک لە مەیخانەیەکـدا پێـی وتـم: "گەڕان بەدوای بەختیاریـدا، لە یەکەم قـومی ئەم شـەرابەوە

کۆتـــایی پـــێ دێـــت.. قســـەیەکی بـــێ مانـــایە؛ ئینســـان ناتوانێـــت لەنـــاو بەختیاریـــدا بـــۆ بەختیـــاری بگەڕێـــت، هەر وەک چـــۆن تـــۆ ناتوانیـــت لە ئەســـتێرەی بەخـــت و هێڵـــی خـــواری لەپـــی دەســـتی ئەو کـــچەدا، هـــیچ شـــتێکی دیکە بخوێنیتەوە، جگە لە ئایندەی دایکت."

ســـەرەنجام بـــڕیم.. ئەو شـــەوەی بـــڕیم، دڵنیـــا بـــووم ئێشـــی ئەم بـــڕینە زۆر خۆشـــترە لە بینینـــی ئەو، چۆنیشـــم پێشـــبینی کردبـــوو، هەر وا دەرچـــوو. مـــن بـــڕیم و ئەو ون بـــوو، ئەوەی شـــێتی دەکـــردم، ئەوە بـــوو هەمـــان شـــەوی بڕینـــی مـــن، ڕێـــک کەوتبـــوو لەگەڵ دیارنەمـــانی دایکمـــدا. ســـەرەتا وا تێگەیشـــتین دایکـــم لە مـــاڵە خزمەکـــان بێـــت، دواتـــر خزمەکـــان وا جوابیـــان کـــردین کە دایکـــم هەڵگیـــرا بێـــت. بـــاوکم ئـــارامی لـــێ بڕابـــوو، نەمانـــدەزانی چـــی بکەیـــن، بەڕاســـت ئینســـان لە وەهـــا حاڵێکـــدا دەبێـــت چـــی بکـــات..؟! کوێـــوە بچـــین و لە کـــوێڕا ســـۆراخی بکەیـــن.. هەمووهمـــان گومانمـــان دەکـــرد لە هـــۆ و لە ونبـــوونی دایکـــم، کەس حەقـــیقەتەکەی نەدەزانـــی، تەنهـــا مـــن نەبێـــت.. منـــی تاوانبـــار.. منێـــک بە بڕینـــی ئەنـــدامێکی خـــۆم، بـــوونێکم خســـتە عەدەمەوە.. بوونێـــک لە دوو شێوەدا.

٢٠٠١

# من له بلووردا

# یان

# نارەوەنێک لەسەر ئاو

تـــۆ ســـڵ له نووســـینی چیـــرۆک دەکەیـــتەوە.. تیاماویـــت! بینووســـیت.. نەینووسـیت.. بینـووس.... بـا خـۆم پێتـان بڵـێم؛ ئەگەر سـەرەنجام مـن خـۆم یەکلایـــی کـــردەوە و ئەم چیـــرۆکەم نووســـی، بـــزانن کە ئەوە ئەو چیـــرۆکە نیـــیە کە دەمەوێ بینوســـم.. ئاوهایـــت.. خۆشـــت بەزەحـــمەت پەی بەخـــۆت دەبەیـــت.. هەردەم ئەوشـــتەی کە وتـــووتە ئەوە نەبـــووە کە ویســـتوتە بیڵێـــی. ژیانیشـــت هەروا دەســـتی پـــێ کـــرد، پـــڕ بەدڵ حەزت دەکـــرد لە بەشـــی شـــێوەکاریی کـــۆلێژی هـــونەر بخـــوێنی، کەچـــی چـــوویتە پزیشـــکی ددان.. لە منـــداڵییەوە خولیـــات بـــوو گەشـــت بـــکەی، دنیـــا ببینـــی.. نەکەویـــتە مـــاڵەوە هەر بەشـــارانەوە بیـــت.. هەر لەســـەفەردا.. کەچـــی لەهەمـــوو ژیانتـــا پێـــت لەم شارە نەبردە دەرەوە!..

تەنـــانەت کە بیـــرت لە خـــودا دەکـــردەوە شـــەوان پێغەمـــبەری ئـــازیزت لە خەونەکاتـــدا دەدەی.. کە لەگەڵ خۆتـــدا دەکەوتیـــتە ئینکـــاری و ئەم جـــارە بیـــرت لە پێغەمـــبەر دەکـــردەوە.. هیچـــت نەدەبینـــی هـــیچ.. بـــاش بـــوو هیچـــت نەدەبینـــی ئەگەرنـــا وەک (مســـتەفا مەنســـور)ی ڕۆمانووســـیی هـــاوچەرخی ئێرانیـــی کە بیـــری لە خـــودا دەکـــردەوە، کە خـــودا بینیـــن ببـــوو بە بـــابەتی

کـــاره نایابەکـــانی، تـــا شـــەویکیان لەخیابـــانی (ئیمـــام عەبـــاس) لە شـــاری (کاشـــان) بەدەم بیرکـــردنەوە لە نووســـینی ڕۆمـــانێکی نوێـــوە کە ڕایەڵەی کارەکـــانی کۆمەڵێـــک مەشـــقی ســـەختە بـــۆ بینینـــی خـــودا، لە ناکـــاو لەو مانگەشـــەوەی هاوینـــدا، مانـــگ چـــوون چـــرایەک لە ناوەڕاســـتی ئاســـماندا بـــۆ چـــرکەیەک خـــامۆش دەبـــێ و خـــودای جەلەجەلال وەک ڕونـــاکییەکی لێـــڵ، چەشـــنی نـــورێکی ڕەش، بەســـەر ســـەری مەســـتورەوە بە ئاســـمانی خۆێـــدا تەجەلـــــلا دەبێـــــت و لەو شـــــەوە بەدواوە مەســـــتور وەک دێـــــوانەیەک بە جادەکانـــدا ڕا دەکـــات و ســـەیری ئاســـمان دەکـــات و هـــیچ نـــاڵێ.. هـــیچ.. مـــن لە ئەزمـــونی خـــودابینیی مســـتەفا مەســـتورەوە زانـــیم ئەوانەی تەنیـــا یەکجـــار خودایان بینیبێ، ناتوانن هیچ ببینن.. هیچ.

تـــۆ کە چیـــرۆک نانوســـیت لە یەک شـــت دەترســـی؛ چـــارەنووس.. تـــۆ شـــەوێک هەســـــتت بەمە کـــــرد؛ دوای چـــــوونەوە ســـــەر یەکێـــــک لە کتێبەکانـــــت و خوێنـــدنەوەی چیرۆکێـــک، ڕەنگـــت تێکچـــوو.. دڵـــت پەلەتـــر خـــۆی دەدە بە قەفەزەی ســـــنگتا و بە گورژمێـــــک لە بەشـــــی چەپـــــی ســـــینەتدا خـــــۆی ون دەکـــرد.. ئەو شـــەوە زانیـــت کە تـــۆ خـــۆت پـــێش چارەنووســـــی خـــۆت کەوتوویـــت.. ئێســـتاش نـــازانی ئـــا لەو دوانزە چرکەیەدا چـــۆن زەینـــت فـــری بـــۆ هەمـــوو ئەو کەســـانەی بەجۆرێـــک لە جۆرەکـــان باســـی مەرگـــی خۆیـــان کـــردووە و دوایـــش دروســـت ئـــاوا مـــردوون..! بیـــرت بـــۆ وەســـتای بەلـــوعە چـــاکردنەکە چـــوو؛ ئەو پیـــاوەی کە دەیگـــوت "بەوەنیـــیە مـــن هەر ئیشـــی ئـــاو دەکەم و بـــۆری مـــاڵان دا دەمەزرێـــنم، مـــن لە کۆتایـــدا بە کارەبـــا دەمـــرم" دوایـــش لە دابەزانـــدنی مـــاتۆرێکی ئـــاودا بـــۆ نـــاو بیرێکـــی شـــێوە هەندەســـەی ئێرانیـــی کـــۆن، کارەبـــا دەیگرێـــت و دەمـــرێ.. یـــا منـــداڵی ئەو ئەکـــتەرە قەڵەوەی هەمـــوو خەڵکـــی شـــار دەیناســـن و ئێـــواران لەســـەر کورســـی بەردەم قاوەخـــانەیەک دادەنیشـــێ و هەمیشـــە بەجـــۆرێکی غەریـــب لە ماشـــێنەکان ڕادەمێنـــێ. ئەو ئەکـــتەرە لە ســـەرەتای ســـاڵی هەشـــتاکاندا لە یەکێـــک لە تەمســـیلییە ئامۆژشـــییەکانیدا کە دەیەوێـــت هەنـــدێ ڕەســـمیاتی نـــاو پرســـەکان لەنـــاو ببـــات،

منداڵەکەی خۆی بە ماشێن دەمرێنێ.. زۆر نابات و لە دوای نمایشکردنی تەمسیلییەکە لە تەلەفزیۆن، هەمان ئەو منداڵە بەکارەساتی ئۆتۆمبیل دەمرێ و باوکی ناچار دەبێ هەموو ئەو نەریتانە لە پرسەکەیدا وەکو خۆی جێبەجێ بکاتەوە.. یا نازانی چۆن ئاوا خێرا و هەر لە هەشتاکاندا خەیاڵت دەفڕێتە سەر ڕووداوی سوتانی کچێکی گۆرانیبێژ، بە ئاگرێکی بێ خۆڵەمێشی وەک گاز.. ئەو کچەی تاقە یەک گۆرانی هەیەو تێیدا زۆر بەسۆزەوە دەڵێت "ئاگرێکی بێ خۆڵەمێش.. دڵی منە وا....." بەخۆدا دێیتەوە، نیشتویتەتە سەر عارەق.. لە خوێندنەوەی چیرۆکەکەی خۆتەوە دەزانی ئێمە هەموومان ڕۆژێک لە ڕۆژان پێشبینییەکی ڕاستەقینەی مەرگی خۆمانمان کردووە و وەک دیمەنێکی خێرا و تیژتێپەڕیش بینیومانە، بەڵام بەسەریدا ڕۆیشتووین و دواتر بووە بەیەکێک لەو هەشت ملیۆن دیمەنەی سالآنە مێشک لە یادەوەری خۆیدا دەیسڕێتەوە.
ئەم دێڕانە دەسڕیتەوە.. سەرلەنوێ دەستپێدەکەیتەوە.. ئەچیتە (چیرۆکی سەرخۆشان).. لە ئۆردوگایەکی زۆرەملێی نزیک شارۆچکەی (کفری) لە دەشتێکی لمینی کاکی بەکاکیدا، لە دامێنەوە خۆت دەکەیت بە ماڵێکی داڕوخاودا.. ماڵێک؛ هیچ ڕەنگێکی تیدانییە..! دیوارەکان بە سەقلێکی بێ ڕەنگ سواخ دراون و تان وپۆی ماڵەکە بە قرژاڵی پەمەیی تەنراوە، قرژاڵی سک و ورگ هەڵدڕاو، دەڵێی خاوەنی ئەم ماڵە لە لابورێکی زیندوەرزانیدا ڕفاندونی بۆ ئێرە..
لابۆرێک کە دوو کچە خوێندکار تێیدا سەرقاڵێ باسکردنی کورە دکتۆرێکن کە هەردووکیان شێت و شەیدای بوون و وا ئیستا کە قسە دەکەن؛ وا خویان دەردەخەن کە کوڕەکەیان زۆر لە لا هیچە و زوو زووش بیری یەک دێننەوە کە ئەم "مراوییە ناهێنێ کاتی پێوەبکوژین!" ئەو کاتانەی ئەم قسانە دەکەن لەم گەردوونەدا دووشت ڕوو دەدات.. من هەندێ جار بیر دەکەمەوە ناشێت لە یەک سات دا هەموو شتەکان ڕوو بدەن.. نا ساتێک خانەی پراکتیکەڵی دوو ڕووداو زیاتری تێدا نییە،

ئێستا تەنیا دوو شت ڕوو دەدەن؛ یەکەم هەردووکیان سوور دەزانن درۆ دەکەن و لەڕووی یەکی نادەن و لە خودا داواکارن ئەم باسە زۆرتر بکێشێ و... دوومیان کە ئەوان لە خەیاڵی هێنانە جێگای دکتۆردا چاوانیان لێڵ بووە، من فرسەت دەهێنم و هەموو قرژاڵە پەمەیەکان کۆدەکەمەوە و وەک سیحربازێک دەیڕفێنم بۆ ماڵی کاراکتەرێکم لە (کفری) لەناو سیخوایەک مەگەز و کۆتایی گەرمای تەموزدا خۆت دەکەیت بەم ژوورەدا کە هەوایەکی خنکێنەر سکی پڕ کردووە و وا خەریکە یەق دەداتەوە.. تەنیا سەرنشینی ناو ئەم خەرابەیە پیرێکی ٧٢ ساڵەیە.. ئەو پیاوە بێ ئەوەی ئەلف و بای پزیشکی بزانێ گەیشتۆتە تیۆرێک سەبارەت بەو پیاوانەی بەمەستیی سەرجێیی لەگەڵ ژنەکانیان دەکەن؛

"منداڵی ئەم جۆرە سەرجێییانە (ئەو ناوی نابوون شەوانی مەستان) کوڕانیان چاوکەژاڵ و کچانیان چاوخومار دەبن.." ئەو قەڵتاغە ٣٨ ساڵ بوو بۆ ناو لێ نانیان، چوو بووە سەر هەر مەلۆتکەیەک، لە چاویانی ڕوانیبوو تا دواجار تیۆرەکەی خۆی پێ دەوڵەمەند بکات.. کە من جێم هێشت خەریکی ئیشکردن بوو لەسەر بیردۆزێک کە پەیوەندی نێوان ڕۆح و مەراقی دەسەلماند. ئەو خۆی ناوی نابوو (بیردۆزی ئازارە قەرزەکان) ئەو دەیگوت "هەموو ئەو ئازارانەی ئێمە دەیچێژین، ئازاری خۆمان نین.. بەڵکو سزای ناو ڕۆحە کۆنەکەمانە کە ٩٢ ملیار ساڵ بەر لە ئێستا ژیاوە و هەر تاوانێکی کردبێ و خواوەند فریانەکەوتبێ لە تەمەنی کورتی خۆیدا سزاکەی پێ ڕەوابفەرمووێ، قەردەکەی هێشتۆتەوە و لە دووبارە و چەند بارەی هاتنی نێو جەستەی نوێیشدا دیسان ناچاری کردووە ئەم بارە هەڵگرێ.. لێرەوە ئەم جەستە نوێیەش هەرچی بکات ناتوانێ کاتی ڕاستەقینەی خۆی بژی و ئەو کاتەشی بە فریای دانەوەی قەرزی گوناهی ژیانەکانی تری ناکەوێت ئیتر ئەمیش دەبێ بەژمارەیەکی تر و گوناهگەلێکی تر لەم ڕۆحە شەکەتەی خۆی بار دەکات.." بەمجۆرە

ڕۆژێک منداڵانێک لەدایک دەبن کە یەک پارچە تاوانن و چوون میمۆریەک جگە لەباری سووری پڕ تاوانی خۆیان جێگای هیچی تریان تێدا انابێتەوە.. هیچ نازانن و هیچ نافامن و لە هیچ ناگەن.. وا دێتە پێش چاو وڕ و دەبەنگبن، کەچی دوایی چیرۆکەکە ئاوها کۆتایی نایەت..

دەچیتە سەر چیرۆکێکی تر.. لە تاقیگەی بلوریی پیتاندنی تۆوین لە (بۆستۆن).. هیچ ناکەیت.. هیچ.. گوێت هەڵ خستووە بۆ دەمەتەقێی دوو پرۆفیسۆری پیر..

-وانییە.. مرۆڤایەتی لەناو ناچێ!

-لەناو دەچێ.

-کتێبی پیرۆز بخوێنەرەوە.. لە دوای کارەساتی لوت-ەوە خودا پەیمان دەدات جارێکی تر ئەم یارییە لەگەڵ ئینسان نەکات.

-دەزانم.. خودا نایکات.. من و تۆ دەیکەین.

-چۆن؟!.. ئێمە لێرەین خزمەتی مرۆڤ بکەین.

-بەڵکو لێرەن کە بیکوژین!..

-ئۆ..و..و.. دکتۆر نیلسن، ئاوا هەمیشە تەمومژاوی قسان دەکەیت.

-نا.. کوا..؟ تەمومژێک لە ئارادا نییە.

-ئەی خێرە ئێمە بووین بە بکوژ؟

-تازەبووین.

-مەبەستت ئەوەیە ئێمە کاتێک پیتاندنێکی سەرکەوتوو ئەنجام دەدەین و کۆرپەلەیەک دروستدەکەین.. بە مانا شۆپنهاورییەکەشی (هەر دروست کردنی ئینسانێک، مەحکومکردنێتی بە مردن) ئاوا ئێمە بووین بە بکوژ؟

-نا.. ڕێک ئاوهاش نا..

-چۆن؟

-دکتۆرە سیلین ئادام هۆ... گوێ بگرە..

- .......

-تـۆ دەزانـی لە پیتانـدنی دەسـت \کـرد دا ئـێمە نمـونەیەک لە سـپێرمی پیاوێـک وەردەگـرین.. دەڵـێم نمـونەیەک، نـاڵێم چـۆن نمـونەیەک.. ڕێ وشـوێنە پزیشـکییەکان دیارییـان نەکـردووە چـۆن نمـونەیەک.. وا هـاتووە تەنیا سەمپڵێک وەربگرین.

-بەڵـێ دواتـریش لە منـداڵانێکی دەسـتکردی شوشـەیدا لەگەڵ هـێلکەی ژنێک دەی پیتێنین و لێ ئەگەڕیین گەشە بکات.

-نا... لێ دەگەڕێین بمرێ!!!

-واوو.. دکتۆر.. دیسان؟

-سـیلین، بـا مـن و تـۆ لەگەڵ یەک ڕاسـتگۆ بـین؛ دەزانـی لە پیتانـدنی سروشـتیدا لە بۆرییەکـانی منداڵانـدا ماراسـۆنێکی گەورە بەڕێـوە دەچـێ.. دڵنیـام دەزانـی و ئەوەشـت لەیـادە کە لە ملیۆنـان سـپێرمی نـاو تـۆوەکە تەنیـا دانەیەک یـان لەحـاڵەتی ڕیـزپەڕدا دووان و چەنـد دانەیەک خۆیـان دەگەیەنن بە هێلکەکان و ئەوانی تر هەموویان دەمرن.

-شتێکی تازە لەم باسەدا نییە.. دکتۆر!

-سـیلین هەیە، بەڵام نەتبینـی.. تـۆ دەزانـی ئەوانەی لە ماراسـۆنەکان دا یەکەم دەبـن، بەهێزتـرینن نەک لاوازتـرین.. بـۆ ئێـرەش هەر وایە.. کەسـێک کە شـایەنی ئەوەیە بێـتە ژیـان و ئەو هەمـوو ئـازارە لەخـۆی بنـێ؛ ئەوە تەنهـا کەسـێکی ئـازایە.. ئەگەر ئەم چانسـە بـۆ سـپێرمە لاوازەکـانیش هەبـوایە.. ئێسـتا کۆمەڵگـایەکی لاواز و کەم ئەنـدام و نەخـۆش بـووین لەسەر ئەم هەسارەیە.

-مەبەسـتت ئەوەیە ئـێمە لێـرە بـێ لە چـاوگرتنی تـاقیکردنەوەیەکی وەکـو ڕاکردن، سپێرمەکان بە هێلکەکان دەگەیەنین؟

-ئێسـتا کە توانـای تێگەیشـتنت لاوزە دەبـێ دوو شـت بڵـێم؛ یەکەم بەتەواوەتـی مەبەسـتم ئەوە نییـە کە تـۆ بـۆی چوویـت. دووەم کە ئەمەیـان با سەپرایز بێت؛ سیلین تۆ بۆخۆت منداڵی تاقیگەیت...

# کتێبفرۆشیی

هێواش هێواش بە پلیکانەکاندا سەرکەوتم، قاچەکانم خێرا خێرا دا دەنا و سست ست بەرزم دەکردنەوە؛ تەپ.. تەپ.. تەپ تەپ.. تەپ.. ت ـە پ.. ت ـە.. ت.. دەنگی پێکانم ڕیتمێکی نامۆ نەبوو بە من؛ خاو دەستم پێ دەکرد و خێرا دەبووم و خاو دەبوومەوە، کۆڵم دەدا. نا کۆڵم نە دەدا، سەر لەنوێ دەستم پێ دەکردەوە. درەنگانی شەوێک، کە ئەم ڕاستییەی ژیانی خۆم بۆ ئەو کچەی مشتەرییەکان پێیان دەوت "تویخی دڵ دەبات" باس کرد. خۆی گرمۆڵە کردە ژێر بەتانییەکە و چاوە ڕەشەکانی کە هێشتا لێڵ بوون بە مەستیی سەرجێییەکی ئاگریی من، بڕینییە ناو خاڵی بە یەک گەیشتنی هەردوو بڕۆ تۆخەکەم و بە دەنگێک من گومانم هەیە کە ئەگەر لێویشی نەجووڵاندابایە، ئەو دەنگە لە ژێکانی قوڕگییەوە بەئاسانی دەگەیشتە من، وتی: "کە سەیریت..! ئەگەر ژیانی تۆ پێناسە بکەم، سێکسێکی تەواویت".. ڕاستی کرد، منیش جارێکی دیکە ژیانی خۆم بۆ هیچ کەسێک نەگێڕایەوە، ئاخر بۆ هەر کەسێکم بگێڕابایەوە، لەو باشتری نە دەپێکا. من جاران وام دەوت، کەچی ئێستا دەمەوێت جارێکی دیکە ژیانی خۆم بنووسمەوە. هەموومان حەز دەکەین ژیانی خۆمان بنووسینەوە و پیشانی خەڵکی بدەین، بەڵام کەسمان لە ڕوومان هەڵنایەت، ئەم حەزە شەیتانییەمان بە یەکتری بڵێین.

من بۆ لەسەر کەشتیی خەیاڵی سۆزانییەک لەم لێڵاوە دانابەزم؟ نازانم!

بەڵام دڵنیـام خـۆم چیرۆکـی خـۆم لە هەر کەسـێکی تـر باشـتر دەگێـڕمەوە. هەمـــوو ئەوانەی ویســـتوویانە ڕۆژێـــک لە ڕۆژان ژیـــانی مـــن بنووســـنەوە، ســـەرەداوی ڕاســـتییەکەیان لـــێ ونبـــووە و مـــن بـــوومەتە قوربـــانیی فەزای دەق و تـــێکەڵ بـــووم بە فەنتازیـــایەک و لەنێـــوان شـــوێن و کاتـــدا گـــۆڕاوم بە کەسـێک، کە هەمـوو کەسـێک بـم، خـۆم نەبـم. کە خـۆم ئەوانە دەخـوێنمەوە، دەڵێم ئەمانە چیرۆکی من نین، ڕەنگە چیرۆکی ژیانی کەسێکی دیکە بن.

کێلـــونی دەرگـــاکە بۆخـــوارەوە پـــاڵ دەنـــێم و کلـــیلەکە لەناویـــدا هەڵ دەسـوڕێنم، بە ڕاسـت.. بە چەپ.. بە ڕا.. هەمیشـە مـن کلیـل لەنـاو کێلـونی دەرگـادا زۆر دەهـێڵمەوە، ئەمشـەویش ڕەنـگە دەرگـاکە نەیەوێـت بەئاسـانی وەک شەوانی دیکە، خۆی بەدەستەوە بدات.

دەرگـــاکە دەکەمەوە و گڵـــۆپەکە هەڵ نـــاکەم، تـــاریکیی ژوورەکەم لە تـاریکیی هـیچ جێـیەک ناچێـت، بـواری هەناسـەی تیـا نیـیە.. قەتیسـم دەکـات.. دەمخنکێنێـت.. دەسـت دەبەم شووشـە بچـووکی شـروبی سـەر مێـزەکەم دەدۆزمەوە و هەڵـی دەقـوڕێنم، تیژتیـژ هەنـاوم دەبڕێـت و دەگـاتە گەدەم. بەرگەی ئەم تاریکـاییە نـاگرم، وەکـو جـاران نـیم، تاریکـایی ئەم تۆقێنێت.

گڵـۆپەکەم هەڵ کـردووە و دەمەوێـت خـۆم بنووسـمەوە، لە قاڵەقـاڵی دەنگەکـانی نـاوخۆم، بەئاگـا دێـمەوە.. دەنگێـک پـێم دەڵێـت بە ئەمـانەتەوە شـتەکان بگێـڕەوە و لە سـەرەتاوە دەسـت پـێ بـکە، دەنگێکـی تـر بینـی لـێ هەڵ دەبڕێـت و دەڵێـت: ئـاخر گێلەپیـاو، خەڵـک چ ئیشـێکی بە سـەرەتای تۆ هەیە؟

مـن قەدەرێـک مـات ڕامـاوم، باشـە سـەرەتای مـن کـامەیە؟ مێشـکم دەگوشـم، یـادەوەریم لەو بەیـانییە کـۆنتری تیـا نیـیە، کە ڕەشـەبایەکی کـورت، بە قەمیسـێکی ڕەش و تەنـورەیەکی کـورتی پڵنگیـیەوە هێنـابووی، دانەویـیەوە و وتـی: "کتێبـێکم دەوێـت باسـی زۆر کـۆن بکـات.. زۆر زۆر کـۆن.. باسـی زەمـانی بەرد بکـات." مـن خەریـک بـوو دەمودەسـت بڵـێم هەمـوو ئەو

کتێبانەی مێژووی چاپ کردنیان لەپێش لەدایکبوونی تۆوەیە، بۆ ئەو مەبەستەی بەڕێزت دەشێن؛ ئاخر جەنابتان بە تەشریف هێنانتان، زەمانێکتان گۆڕی. بەڵام نەموت.. من دەتوانم ئەم یەکەم بەیانیی بینینە، بکەمە یەکەم ڕۆژی خۆمی مانگی خۆمی ساڵی خۆم.

دەتەوێت وا دەست پێ بکەیت دوو دڵیت، خەتێک بەسەر ئەو دێڕانەدا دەهێنیت. خەتە درێژەکان لەو خەتانە دەچن، کە دەتهێنان بە ژێر نووسینە گرنگ و جوانەکانی ناو کتێبەکاندا. دواتر هەر ئەو خەتانەم دەهێنا بەسەر دە خەتی ورد وردی لە تەنیشت یەک، کە ژمارەی سێکسەکانی کچێکی، لە ڕۆژانە خانەکەی خۆیدا تەواو دەکرد.

هەموویان خانەی خۆیان هەبوو، من دەموت دەبێت بەو تایبەتمەندییانەی خۆتانەوە بژین، کەچی هەمیشە (شەوێن خۆشی) پەنجەکانمی دەلێسایەوە و دەیوت: "توخوا ناوی من بخەرە ناو خانەکەی (شەیما قەپات)ەوە." من دەموت نابێت، تۆ کە دەتەوێت ناوت هەبێت، دروست ببیت، کوڕان کە چوونە حەمامەوە، تۆیان بیر بکەوێتەوە. تۆ ئەگەر دەتەوێت مشتەرییەکانی خۆت زیاد بکەیت، دەبێت لە خانە تایبەتەکەی خۆتەوە دەست پێ بکەیت.

جارجار تووشی وەهمێکی سەیر دەبوو، خۆیی لێ دەگۆڕا. چەندین جار بە وردە ماچێک یان مەمک گوشینێک، خەتێکی وردی بۆ (شەیما قەپات) دا دەنا و وای دەزانی ئەوە یەکەمین جارە ئەو کچە ببینێت، یان یەکەمین جارە بەو کچە بگات، کە ساڵانێکە خەیاڵی ئەمی داگیر کردووە. ڕا دەمام، خەیاڵ دەیبردمەوە، چاوەکانی دەیانبردم.. خۆمم دەدی توند باوەشم کردووە بە کەمەری سمۆرەیەکدا و ئەویش خۆی شل کردووە و بە مەکرەوە جارجار خۆی ڕا دەپسکێنێت، رووتو قوت هەردووکمانین؛ من شەلاڵم لە ئارەق، توکەکانی کلکی ئەو هەر بە پێوە، سیسەمێکی نوستنن.. سڵ لە دەم و لوتی ناکەمەوە، ڕیزێک دانی ورد، لێوێکی تەنک شاردوونیەتییەوە.

دەست دەخەمە ناو پەنجە وردەکانییەوە، چنگ و نینۆکی نییە، دەستم ئازاری دەگات.. توند تر دەستم دەگوشێت، زیاتر ئارەقم کردووەتەوە.
من نازانم ئەوەی لە باوەشم دایە، (ئەو)ە یان شەیما؟ ئێستاش نازانم من (ئەو)م لەوێ بەجێهێشتووە و بەدوای شەیمادا هاتووم؟ یان شەیما لەوێیە و من بەدوای (ئەو)دا لێرەم..؟ نازانم هەندێک لەوانەی پێش من ئەم چیرۆکەیان نووسیوەتەوە، دەڵێن (ئەو)و شەیما هەر یەکێکن. وەلێ من وانالێم. ئاخر چی بڵێم کە من خۆم ئەکتەری ئەم فیلمەم و دۆستەکەمم ونکردووە. کوا بینەرێکی ڕۆمانسی، پەنجەی ناسکی بنێتە سەر یەکێکیان و بڵێت: هۆو.. پیاوی ون، ئەمەیان مەعشوقە ڕاستەقینەکەتە.
هەست دەکەم دەمارەکانی لێ دەدەن، گەرما تەقاندمی.. وەختە لە هۆش خۆم بچم، کە قریوە پڕ لە شەهوەتەکەی ڕام دەچڵەکێنێت و بە دێڕێک کە پڕە لە (هـ)ی تینوو، دەیوت: "دەیە، کواهـ خەهـ تەهـ کەهـ تـ هـ.." شەیما حیسابی ڕۆژی وەردەگرت و تۆ خەتێکت دەهێنا بەسەر نۆ خەتی نۆ پیاوی تر و ماچێکی خۆتدا.
من ئەم خەتخەتێنە دەمکوژێت، هەوراز و نشێوییەکانی دێڕێک، شتێکم پێ دەڵێن، کە ئەگەر هیچیش بێت، بەڵام بیابانی خەتێکی ڕێک، جگە لە مەرگ و مەرگ هیچی تر لەم نیوەشەوەدا نادرکێنێت. ئەم شەوە درەنگە، ساڵیادی تەلەفۆنێکی ئەوە، کە بە چپە چەند پیتێکی پچڕپچڕی بۆ ناردم. من درەنگێک تێگەیشتم کە ئەو وتوویەتی: "من و تۆ پێکەوە پەڕەیەکی نوێ هەڵ دەدەینەوە." من سەفەرێکی تولانیم کرد؛ چەندین وڵاتم دی، چەندین ئەرزی خوا گەڕام. کەشتیی گەورە گەورە، فڕۆکەی زەبەلاح، شەمەندەفەری نوێ، درێژترین ڕەفەکانی کتێبخانە، کورتترین مەوداکانی پەیوەندی و ئیمەیل. ئەو (پەڕە نوێ)یەش هەبوو‌ایە، تۆ لە کوێ بوویت، تا پێکەوە هەڵی بدەینەوە؟!

هاورێیەکم کە لە شکستی عەشقەوە، دەستی دابووە بازرگانیی شووشە و سەرکەوتنێکی گەورەی بەخۆیەوە بینیبوو، ئەو کە ماڵەکەی یەک پارچە فەخفوری و چینی و کەمۆڵە و مێز و تەنانەت کورسیی شووشە بوو، لەسەر یەکێک لەو قاپانەی وێنەی خیامـ-ی بە جامێک شەرابەوە تێدایە، بەدەست و خەتێکی باریک نووسیبووی: "ژیان پەرداخێکی شووشەیە بەدەست منداڵێکی چەتوونەوە." ئەو عەسرێکی درەنگ، بەوپەڕی لە خۆبایی بوون و بەدەم بستە خواردنەوە پێی وتم "برادەر، عەشق وەکو باری شووشە وایە.. کە دەستێکی کرد، ئیتر خێرەکەی کورت دەهێنێت.. باری باش ئەوەیە خۆت لە خاوەنەکەی بکڕیت." من تویکڵی بستەیەک بەو هەموو ڕەقێتییەی خۆیەوە پوکمی هەڵ دڕی بوو، ئەویش دەیوست بە لوغزەوە پێم بڵێت: عەشقی ژنێکی مێرددار، ناتەندروستییەکەی لەوەدایە لە فەشەلییەوە تۆی خۆش دەوێت.
کەچی هەر ئەو عەسرە، خوشکی ئەو بازرگانە بە منی وت: "جەنابی میوان کاکم ڕاست ناکات، هیچ شتێک لە عەشقی ژنێکی مێرددار گەورە و پیرۆزتر نییە؛ تۆ بڕوانە ژنێک بەسەر مرۆڤێکی تردا باز دەدات، تۆی خۆش دەوێت." من گێژ بووم، بەرچاوم ڕەش بوو، بستە و کچەکە تێکەڵا بوون، خوشک و براکەم بەسەر یەکترییەوە بینی.
ڕشامەوە و ڕەشاوم هەڵ هێناوە.. ڕەشاو بەرپێمی تەڕ کرد، جۆگەلەی بەست بۆ خوارەوە، من هێڵنجم دەدا و ڕشانەوە دوایی نەدەهات. ڕەشاو قولەپێمی تەرکرد، من چاوەکانم دەر تۆقی بوو، دەکۆکیم و پڕ بە دەمم ڕەشاو دەهات.. ڕشانەوەیەک نەبوو بیر لە تەوابوون بکاتەوە، قوڵپی ڕشانەوە ڕەشەکە، ئەو خوشک و برا ڕووتەی، بەیەکەوە ڕەش تر کرد.
هەموو یەکشەمەوانی هەفتەیەک لەو سەری بازاڕەکەوە دەر دەکەوت، لوتێکی قنجی بچووک، لێوێکی تەنک و چەناگەیەکی شێوە قۆقزیی هەبوو، هەمیشە سڵی لە سێبەرەکەی خۆی دەکردەوە، گومانی لە هەموو شتێک دەکرد.. گومان ئەوی دەبردەوە سەر بنەچەی گیانەوەرێکی

وردیلە، کە پێی دەڵێن سمۆرە.. دەمزانی بۆ کتێبە مێژووییەکان هاتووە، بۆ ئەوانەی زەمانی ئەشکانی، هیلینیستی، سەردەمی وەرکا و ئاشوری دەگەڕا. دەتوت ئەم کچە زۆر زوو شتێکی ونکردووە و ئێستا دەیەوێت لە ڕێگەی ئەو کتێبانەوە ئەدرەسێکی ئەو شتەی دەست بکەوێت. هاوتەمەنەکانی ئەو، لە کتێبی هونەری چێشت لێ نان، بوردەی جلوبەرگ و گۆرانیی هونەرمەندە گەنجەکان زیاتر، هیچی دییان نە دەکڕی.

ئەم کتێبەکانی هەڵ دەگرت و ماوەیەکی زۆر دەستی بەسەر بەرگەکانیاندا دەخشاند، نزیکی دەکردنەوە لە دەم و لێوە تەنکەکەی، من سەرم دا دەخست، دەموت با شەرم لە من نەکات و تێر ماچیان بکات.

کەچی ئەو شەوێکی درەنگی پاییز، پێیوتم: من بە بۆنی ئەو کتێبانە، سوکنایی بە ڕۆحمدا دێت، ئەگەر بۆنی ئەو کتێبە کۆن و زەردانە هەڵ بمژێت، دەستبەجێ دەچیتەوە ئەو سەردەمانە؛ خۆت دەبینیت جووتێک سۆلەت لە پێدایە و قەیتانە درێژەکانی تا نزیک ئەژنۆت لەسەر گۆشتەکەت توند کردووە، پارچەیەک پێستەت لەبەردایە و دەستبەتاڵ بەناو ئەو حەشاماتە قژ ئاڵۆزکاو و مەنگەدا، دێیت و دەچیت.

ئەو منیشی فێری ئەو بۆنە کردبوو؛ بەیانیان کە کتێبەکانم ڕێک دەخست، دەبوایە تێر تێر بۆنی کاغەزە زەردەکان هەڵ بمژم. ئێوارەیەک هەموو کچەکانم کۆکردەوە و کۆرسێکم پێ وتنەوە، ویستم قەناعەتیان پێ بکەم کە لوت بەدبەخت ترین پارچەی جەستەیە، چونکە ماوەی فریودانی لە هەر ئەندامێکی تر کەمترە. لوتی پیاوێکی هەستیار دەتوانێت زۆر زوو هەست بە باکگراوندی بۆنی پێشوو بکات. من لەو قسانەدا وتم: "ژن بۆن بەکار دەهێنێت، تا هەست بە بۆگەنییەکەی ناخی نەکەین." من زۆرم قسە دەکرد، هەمیشە وابووم، تەواو پێچەوانەی ئەو، دەبوو لە هەموو بابەتێکدا درێژدادڕیی تەواوم بکردایە. ئەوان کە گوێیان لێ گرتووم، لە بەرئەوە نا زۆریان خۆش دەویێم و حەز بە قسەکانم دەکەن، نا.. ئەوان باش دەیانزانی هەر کەسێکیان نەیەوێت گوێم لێ

بگرێـــت، ئەوە دەبـــوو بەیـــانی ئەو ئیشـــەی لە لای کەســـێکی تـــر بدۆزیبایەتەوە.

ئەو کـچە بەدبەختـانە نەدەکـرا بـۆن بەکـار نەهێـنن، ئـاخر مشـتەرییەکانمان لەدەسـت دەچـوو. مشـتەریی چەور هەمیشـە گـێلە، دەنگوباسـی کچەکـانی لای مـن، لە شـاردا تەقیبـووەوە.. ئەوان گرانتـرین بـۆنی بیانییـان لە وڵاتە عەرەبییەکـــانی باشـــوورەوە پـــێ دەگەیشـــت. هاوبەشـــیمان لەگەڵ بەناوبـــانگترین کۆمپانیاکـــانی بـــۆنی تـــورکی و فرانســـی هەبـــوو. ئەوان دەیـانزانی بـۆنی نەرم، بـۆنی تیـژ، بـۆنی پـڕ، بـۆنی قـورس، بـۆنی تـورت و جۆرەها بۆنی سێکسیی ترمان بۆ ڕەوانە بکەن.

هەڵـبەتە منـی کتێـب فـرۆش، دەمزانـی ڕەنگـی بەرگـی کتێبەکـان چ کـاریگەرییەکی جۆراوجۆریـان لەســەر خوێنەرەکـان هەیە و کامیـان پـڕ فرۆشـترینیانە، بەڵام ئەم تێگەیشـتنەم چڕتـر بـووەوە دوای سـاڵانێکی دوور و پـاش سـەفەری بەدی ئەو. ڕاستییەکەشـی ئیشـەکەم وای دەخواسـت ئەو پسپۆڕایەتییە بەدەست بهێنم.

مـن هەمیشـە قسـەم هەبـووە، هەر شـەوێک یەکێـک لەو کچـانەم لای خـۆم گـل دابێـتەوە، شـەڕی ئەوەم پـێ فرۆشـتووە ئەو سـتیانە سـوورەی بگۆڕێـت، کە ئەمـڕۆ پیـاوە گەلۆرەکـانی ئەم شـارەی پـێ فریـوداوە. مـن بە غرورێکـی شـاعیرانەوە دەمـوت: "کچـێ سـوور سـەقەتترین و سـەخیفترین ڕەنگـی دونیـایە، سـوور هەمـوو شـتێک دەڵێـت، سـوور جێـیەک نـاهێڵێتەوە بـۆ لـوغز، سـوور چـاو دیـل دەکـات و پیـاو زوو دەوروژێنێـت و زووش زایەی دەکـات. سـوور ناهێڵێـت هەقـی تەواوەتـی بـدەین بە یەک، دە کەرە، ئەو لیباسـە سـوورەت دابـکەنە." خەریکـم شـتە تایبەتەکـانی خـۆم دەڵـێم، ئـاخر مـن هەمیشە لێرەی نووسین دەترسم. تا ئێستاش بەگومانم لەوەی بنووسم.

کە پێڵووەکانـت دا دەخەیـت، تەزوویەکـی تیـژپەڕ بەسـەرتدا دێـت، گێـژ دەبیـت، بەرچـاوت لێـڵ دەبێـت و ناتەوێـت چـاوت دابخەیـت، ئـاخر بەردەوام نوسـتن زیـاتر لە بێـداری ئـازاری ڕۆحـی تـۆی داوە.. گونـاهی منـیش نیـیە،

ئـــاخر خۆشم (دەویســـت) یـــان (دەویـێــت)، نـــازانم کـــام لەم دووانە بنووســـم.
ئەو کـاتەی مـن وێـنـەی ئەوم لەویـادا هەڵـگـرت، هەرزەیەکـی بێئەزمـوون بـووم لە ژیـان. مـن چـووزانم پێڵـوو تەنها یەک جـار وێـنـەی تیـا هەڵ دەگیرێـت، تـۆ بـێ خەبەر بوویـت لەوەی ڕۆژێـک دێـت لەم وڵاتە ســـارد و دوورانەدا، بەدوای وێـنـەی حەقیقیـی ئەودا دەگەڕێیـــت و ئەو جـــگە لە چــاپی دیـــوی نـــاوەوەی سەر پێڵووەکانی خۆت. لە گشت شوێنێک ونە.
دەمارەکـــانم خـــاوبوونەتەوە، جەســـتەم دەکشـــێت، پێســـتم خۆشـــتر دێـــت بەدەســـتەوە، ڕەنـــگە شـــروبەکە کـــاریگەریی خـــۆی بووبێـــت باشـــتر، بەڵکـــو بتـــوانم ئـــارامتر بنووســـم، دوور لە قینـــی ئەو ڕۆژانەی ئـــازارم تیایانـــدا چەشتووە.
بەدیـار کتێبەکـانەوە خەیـاڵ بـردووتیەوە، دڵـت پەلە تـر لـێ دەدا، خەیاڵـت دەیچرێـت. دەزانیـت ئەو کـچە لەو نزیکـانەیە، ئەگینـا تـۆ لە ژیـانی خۆتـدا ئـارامترین پیـاو بوویـت. ئەو کە نزیـک ببـووایەوە، مـن قسـەم بەئاسـانی بـۆ نەدەکـرا؛ چەنـد پیتـێکم دەنوسـاند بەیەکەوەو هەنـدێک پیتـی تـرم دەپەڕانـد، دەسـتم دەلەرزی، هەسـتم بە سـووکیی کێشـی خـۆم دەکـرد، دەمزانـی تـازە زەوی ناتوانێـت مـن کـێش بکـات. هەمـوو شـتێکم بیـر دەچـووەوە و دڵـم خێراتر لێی دەدا.
بڕیـــارێکی شـــێتانە نیـــیە ئەگەر بڵـــێم بەنیـــازی گەڕانەوەم. مـــن لەم وڵاتە ســـاردانە، هـــیچ هەڵ نـــاهێنجم، دەگەڕێـــمەوەو ڕەنـــگە دەســـت بە کتێبفرۆشـــتن بـکەمەوە. خـاڵی کۆتـایی بـۆ ئەم گێلێتیـیەی خـۆم دادەنـێم.. چیتـر ڕاناکەم بەدوای دەنگێکـــدا، کە زۆرتـــر بە ســـەراب دەچێـــت. مـــن بـــۆ وڵات دەگەڕێـمەوە، وەلـێ دڵنیـام ئەم خەیـاڵە شـێتە لـێم ناگەڕێـت و ڕۆژێـک هەر دەمهێنێتەوە ئەم غوربەتە.

٢٠٠٤

# بــــــــــــازنــه

**تەرم**

لە سەری کۆڵانەکەی خۆماندا دەچەقم.. چاوم دەرتۆقیووە، ئەژنۆم شل دەبێ.. خوێن هورووژم بۆ سەرم دێنێت، ئەوەتا ڕوخسارم سوور هەڵگەڕاوە.. نیگام تیژ فرییوە.. من هەندێ جار خێرایی سەیر کردن لە خیرایی تیشک بە زیاتر دەزانم؛ کە بونیام تەماشای شتێکی باوەڕ نەکردە دەکات، کات دەبێت بە سفر، بەمە دەڵێن حەجمیین.. من ئێستا وام لێ هاتووە.. ماڵە بچکۆلانەکەمان لە ناو غەڵبەغەڵبدا دیار نییە.. لە نێوان هەموویاندا قیژەی دایکم دەناسمەوە.. من هەروا ڕاوەستاوم کە دەبینم بە پلیکانە ئاسنە تەسکەکەدا، چوارکەس لە ژوورەکەی منەوە لە بەتانییەکدا تەرمێک دەهێننە دەرێ.. قاچە درێژەکانی لە جوتێ گورەوی دڕاوی ڕەشدا لە بەتانییەکەوە شۆڕ بۆتەوە، بەجۆرێ خۆی شل کردووە وەک ئەوەی بیەوێت بڵێ "بەس پێم بگاتە سەر ئاسنە ژەنگاوییە ساردەکە، بۆخۆم دەڕۆم" من هەر لە شوێنی خۆم چەقیووم کە تەرمەکە لە پشتی پیکابێکی کۆندا بەبەردەممدا دەفڕێنن، فریا دەکەوم بەخێرایی چاو لەخۆم بکەم کە ئاسودە و نەرم ڕاکشاوم.. تەنیا بەشی چەپی سەرم سەرمایەتیی کە لە بەتانییەکە ترازاوە و کەوتۆتە سەر پلێتە تەزیووەکەی پیکابەکە..

**مەرگی من**

بەیانییەکی زوو لە ریماگریانۆس لە قەراخ دەریای کاریبی، شەش میل لە دووریی شاری پامبلۆنا دیگرۆ، خەڵکی کوخە بچووکەکانی ئەو کێوە سەخت و سروشتە درە بەدەنگی زرمەیەک پێشوازیی لەرۆژێکی سارد و باراناوی دەکەن.. ئێستاش ئەو کێشمەکێشە بۆ خەڵک تەواو نەبووە؛ کە ئایا بەو تەنیا گولەیە چیرۆکێکی نوێم نوسیووە یان خۆم کوشتووە..؟

سەری هەمنگوەی پرپرە لە باڵندە، ئەو خۆشیی راوچییەکی کارامەیە.. هەموو رۆژێک باڵندەیەک راو دەکات و سەرلەئێوارەکەی چیرۆکێک دەنێرێت بۆ رۆژنامەی لۆمۆنداستێ.. شەبەقییەکیان نوسەر کار لەسەر یەکێک لە کۆنترین ئایدیاکانی خۆی دەکات و دەیەوێت یەکەم دێری رۆمانە نوێیەکی بنووسێت کە بەخێرایی ئەوە بەسەریدا دێت؛ کە بۆ نوسینی رۆمانێک پێویستی بە نێچیرگەلێکی زیاتر لە رۆژان هەیە.. دەستبەجێ هیمینگوای خەونی راوکردنی هەموو جەنگەڵەکەی ناو سەری خۆی دەیدات لە کەلەی..

**خەیاڵی ناو ئاوێنە**

خەیاڵەکان چوون ئاسکێک لە سێبەری خۆشیان سڵ دەکەن.. دەترسن.. بتەوێت بیاننوسیتەوە زیرە دەکەن هەڵدێن.. خەیاڵ بۆ ئەوەندە لە نوسین زارەترەکە..؟ نازانم.. ئێستا دەمویست شتێکی زۆر نایابت پێ

بڵـێم، هــاتم بینوســمەوە کە وەک تەمێــک ڕەوییــەوە.. دروســت وەک تەمــی ڕوخساری کچێکی کاڵ لە کتێبفۆشیی ژێر زەمینەکە..
بــانگم دەکــات.. لێــی دەچــمە پــێش، یــادەوەریم دەگوشــم؛ ئەم کـچە غەریبێکــی ئاشــنایە.. بە ئەســپایی دەڵێــت "تــۆ توانــا نیــت..؟" ئەڵــێم بــا ئەوم.. دەســتم دەگرێــت.. ســەیری چــاوم دەکــات.. چــاوی خــۆی ســەرڕێژ بــووە و فرمێســک لە پێڵــوی ئەســتورییەوە ســەر دەکــا.. مــن حەپەســاوم.. کەس نــاتوانێ بزانــێ کە بونیــام لە کــاتێکی ئــاوادا دەبێــت چیــی بکــات..؟ ئەڵــــێم جەنابتـــان؟ بەدەم گریـــانەوە هەروا لـــێم هەڵ دەڕوانـــێ و دەڵێـــت "وایــی... چەنــد گەورە بوویــت..!" خەریــکە لەســەرخۆم دەچــم هەروا وڕو گێـژ دەڵــێم تـۆ کێیــت..؟! قســە ناکـات هەر ورد دەبێــتەوە، هەمــوو پێســتی دەموچــاومی بە نیگــای دامــاڵیوە، ئێســتا مــن وەک جومجــومەیەکی ڕووتــی خوێنــاوی لەبەردەمیــدا ڕاوەســتام، لێــی دەپــاڕیمەوە و پێــی دەڵــێم ئــاخر کـچە کــاڵەکە تــۆ کێیــت..؟! بە هێواشــێ چــاوی هێجگــار تەڕی لێــک دەنێــت و لەبەردەممــدا دەبــێ بە تەم.. لە مژێکــی ســپی تەنکــدا دەنگێکــی کچــانە دەڵێت "من تـــــــــۆم".

**حەلاج**

چــواردەورم زوڵــمەتە.. ڕوناکــاییەک لە منــدایە خاپورکــار.. ئەو ڕەشــەخەڵکە دەبینــم وەک عەشــاماتی چــاخێکی کــۆن لە مەراســیمی ئەم کوشــتنەدا تەهلــیلە دەکێشــن، حاڵییــان لــێ دێــت.. مــن هەزار بەرد دەخــۆم، بەردەکــان هــیچم لــێ نــاکەن، زامــی کــۆنم هەڵــدەدەنەوە.. ئەوەتــا جونەیــدی بەغــدادی لە نــاو بەردهاوێژانــدا ڕیــزی لە مــن گرتــووە.. هەنگــاوی شــەکەتم دەمبــاتە بەردەمیـــی.. ئەو دەســـت دادەهێنێـــتەوە گوڵێـــک بگـــرێتە مـــن کە وەک تارماییەکی بریندار هاوارێکی ترساو دەکەم "ئـــــــــــــاخ خ خ خ...!"

زمـــانم لەنـــگە، بەرچـــاوم لێـــڵ، ئێســـتا ئـــازاری ئەو جـــێ بەردانە هەموویـــان بەیەکەوە دێـــن، پێڵـــوی نـــاو بـــازنەی مۆربـــووەی چـــاوم بە ئاســـتەم بەرز دەکەمەوە و لە دڵـــی خۆمـــدا دەڵـــێم "مامۆســـتا مـــن مەنســـور نەبـــووم.. مـــن نووسەری ئەم چیرۆکەم".

٢٠١١

# تکایه مەمرن

وام هەست دەکرد، لەم دونیایەدا کەس هێندەی من تەنها نییە، تەواوی ژیانم ڕۆمانێکی درێژ بوو بەتەنهایی دەستی پێ کرد و بەتەنهاییش کۆتایی هات. زۆرجار لەبەر خۆمەوە دەمگوت: "من کۆنترین پیاوی نێو مەملەکەتی تەنهاییم."

ئەگەر سوکناییەکی شک ببردایە، ئەوا لە نقومبوون لە دووکەڵی جگەرەکەی و لە فرکردنی پێکێک مەی دا بوو. پێچەوانەی هەموو ئادەمییەکانی تر، بە دیتنی مردوو خۆشحاڵ دەبوو. کە مردووییەک بە بەردەمیدا ڕاببوردایە، بەهەموو هێزی دەیقیژاند: "سڵاو، کەمێکی دی منیش دێم." بەڵام ئەم قیژەیە سنووری نێوان دوو لێوی نەدەبەزاند و سەرەنجام لەنێوان ژێکانی قورگیدا فەنا دەبوو.

تاکە پرسیارێک کە ئەم عەودالی وەڵامەکەی بوو، ئەوە بوو: "تۆ بڵێیت مردن تامێکی تری ژیان بێت؟" ئەدی کەنگێ ژیان تامی هەبووە؟ ئەگەر پاشماوەی ئەم ژیانە پووچە بێت، ئەوا مردنیشم ناوێت "نا.. مردن پاشماوە نییە، مردن بۆ خۆی ژیانە. ژیانێک نە دووبارە بوونەوەی تێدایە و نە چاوەڕوانی." ئەمە قسەی ئەو شاعیرە بوو کە لە سوچێکی چایخانەکەدا بە ڕەبەنی دەژیا و هەر بە ڕەبەنییش مرد.

نە جگەرە و نە مەی و نە هیچ شتێکی تر، دادی ئەم دەردە نادەن. ئەو شروبەی لەم دوادوایییەی ژیانیشمدا فێری بووم، جگە لە ئۆخژنێکی کاتی، شتێکی تر نەبوو.. ئێستا دەزانم هەموو ئەو شتانەی مرۆڤ بۆ قوتار

بـــوون له چـــنگه خوێناوییه‌کـــانی ته‌نیـــایی په‌نایـــان بـــۆ ده‌بـــات، جـــگه له خۆفریودان، شتێکی تر نییه.

ئه‌و ســاته‌ی ژنێـک سـنگه سـپی و پڕه‌کـانی ده‌خسـته به‌ر که‌ڵـبه تیـژ و ده‌مه لـیکن و بۆگه‌نه‌کـانی ئه‌وان، مـن بێـزم له خـۆم ده‌کـرده‌وه، نـــا.. ئه‌مـانیش ئه‌و ڕه‌نـــگه ســـپییه نـــین که مـــن بـــۆی چـــووم، "قاقاکـــانی ئـــێمه و زه‌رده‌خه‌نه‌کـانی پیـاو هه‌مـوو شـتێکن.. ئیتـر تـۆ چیـت ده‌وێـت؟" ئه‌وه قســـه‌ی گێله‌ژنێـــک بـــوو، به ئه‌زموونه‌کـــانی ته‌مه‌نـــی پێـــی گه‌یشـــت بـــوو. وه‌ختـی خـۆی له‌سـه‌ر جێگـایه‌ک پێـی وتـم به‌ر له‌وه‌ی دڵنیـا ببێـت له‌وه‌ی که من پیاو نیم.

ســـه‌رده‌مانێک ڕقـــم له په‌پـــووله بـــوو، ئاهــــ.. چ نه‌شـــاز بـــوو جریـــوه‌ی پاســـاری، چ تیـــژ و که‌ســـکون بـــوو بـــۆنی گـــوڵ.. له‌و نیشـــتیمانه‌ی منـــدا، شـــه‌کری تـــاڵ هه‌بـــوو، چـــای ســـپی.. نـــازانم هه‌ر خـــۆی ڕاســـتییه‌که‌ی وابـــوو، یـان وێنه‌کـان ئـاوه‌ژوو ده‌که‌وتـنه سـه‌ر په‌رده‌ی چـاوم. هه‌مـوو شـتێک له‌وێ هه‌بـوو؛ پـڕ پـڕ بـوو له‌و گـوڵه کێـویلانه‌ی له لێکـردنه‌وه‌دا، هه‌مـوو جارێـک خۆیان ڕاده‌پسکاند و ده‌یانوت: " ده‌ستت لابه.. عه‌شق له حه‌یزدایه."

بـــاپیرم که له ته‌مه‌نـــی (١٠٣) ســـاڵیدا دانه‌کـــانی ده‌رهـــاتبوونه‌وه و پـــرچه ده‌روێشـــییه‌کانی ڕه‌ش ببـــوونه‌وه، ئه‌و پیـــاوه‌ی ده‌ســـتی به‌ر به‌فـــر بکه‌وتبـــایه، ڕه‌ش ده‌بـــوو، له هه‌ر ماڵێـــک دابنیشـــتبایه، خـــانووه‌که ڕه‌ش هه‌ڵ ده‌گه‌ڕا. ئه‌و پیـاوه به‌چه‌نـد ڕۆژێـک به‌ر له مردنـی، به‌ده‌م دامه‌کـردنه‌وه پێـی وتـم: "عیسـا گێـل تـرین مه‌خلـوقی خـودایه.. ئه‌و پێغه‌مـبه‌ره ترسـنۆکه‌ی نایه‌وێـت به حه‌قـــیقه‌ت بگـــات، ئه‌و پێغه‌مـــبه‌ره بـــۆ نایه‌وێـــت و مـــن بـــۆ ده‌مه‌وێـــت بمـرم؟!.. ئه‌ی خـودا بۆ له بـێ دڵـی کردنـی مـرۆڤ چێـژ ده‌بینێت؟ مـن خـۆم ده‌زانـــم ته‌نهـــا گـــڵ ده‌وێرێـــت لاژه‌لاژ حه‌قیقه‌ته‌کـــانم بـــۆ بگێـــڕێته‌وه.. گـــڵ؛ بـــاوکه ماتریـــاڵییه‌که‌ی مـــرۆڤ." ئه‌و پیـــاوه ڕدێـــن ڕه‌شـــه ته‌واو به هه‌ڵه‌دا چـوو بـوو، یـان خڵه‌فـا بـوو، چـونکه مـن له‌مێنـده‌ر نه‌حه‌قـیقه‌ت ده‌بینـم و نه‌حه‌قیقه‌تیش بوونی هه‌یه.

جگەرەکانی لە زیندەبەچاڵ کردنی زەمەندا دا دەگیرساند و لە چاوەڕوانیی مردندا بۆ خۆیان دەکوژانەوە. مردن، ئەو قومارچییە لێزانەی هەموومان پێی دەدۆڕێین. ئەو ئێجگار کەم دەدوا، ئەگەر بشدوایە، بۆ ئەو پیاوە تەوا و سەرکێش و یاخییە دەدوا کە لە ناوەوەی خۆیدا بوو: "چ کائینێکی بێ جورئەتە مرۆڤ، وەختە لە مردن بتۆقێت.. مردن شتێک نییە سامناک بێت، ترسی ئێمە لە مردن، مردنی کردووەتە شتێکی سامناک." پێی دەوت: "تابلۆ ڕووتەکانی ئیرۆس، بێزیان نایەت بە بزمارە ژەنگاوییەکانی ئەم دیوارە پۆشتەیەی گالێری مەرگەوە بن، کەچی من بە پۆرتریتێکی خۆمدا، خۆم داکوتیوە و دیوارەکە بە خۆیم ناگرێت." هەموو ئەو مەنەلۆگانەی لەگەڵ خۆیدا، ئەوەی بۆ دەوروبەر سەلماند؛ کە ئەم تەوا و شێت و دێوانەیە. کەم بوون ئەو شتانەی لای ئەم پیرۆز بوون، تەواو بێ بایەخانە لە پیرۆزییەکانی دەڕوانی، کەچی دراوسێکانی وتیان: "لە بەختی خۆی، ئەو بەهەشتییە لە سپێدەیەکی هەینیدا مرد."

کە مردم، هیچی تیا نەبوو بەلامەوە نامۆ بێت. وەک ئەوەی پێشتر ئەو جێگەیەم دیبێت، یان ئەو چیرۆکەیان بۆ گێڕابێتمەوە. نە ئازاری هەبوو نە وەک خەو وابوو، هەتا خستیانمە گۆڕەکەوە، ئاپۆرەی خەڵکەکەم دەبینی، کە گۆڕەکەیان داپۆشی. لەژێر باڵی ئەو تاریکاییەدا بێ پەروا ڕاکشا بووم، هەستم نەدەکرد هیچ شتێکی گرنگ ڕوویدات.

لە سەرەتادا نەم دەویست چاوەڕوان بم، بە قسەی مامۆستا ئاینییەکە: "ئەوان لەوێ حازر دەبن، چاوەڕوانن تۆ بچیت و بتبەن." قەدەرێک بێ دەنگی، گۆڕەکەی گەمارۆ دا.. کەس نەهات.. هاواری منداڵە دارعود فرۆشەکان نەبێت، هیچی دیکەم نەدەبیست.. هەر کەس نەهات.. وردە وردە لەگەڵ شوێن و کارەکەم -کە گۆڕ و ڕاکشانە- ڕاهاتم. من گوێم بۆ خورەی ڕووباری شیر هەڵخستبوو، کەچی بێ دەنگی بە پێچپێچەکانی

گوێمـدا پیاسـەی دەکـرد، حەزەرم دەکـرد هـا ئێسـتا هـا تـاوێکی تـر بـبمە کڵپەی ئاگرێک، وەلێ ئەوێ ڕا باوەشێکی سارد و شێدار بوو بۆ من.

کە هەسـتی کـرد ئەوێـش بە ژیـان دەچێـت، بـێ هـودەیە و چـاوەڕوانیی_ چـاوەڕوانیی هـیچ_ هەوڵیـدا لەوێـش یـاخی ببێـت.. زۆری لە خـۆی کـرد، هێنـدە گـڵەکەی سـەریان پەسـتا بـووەوە، نەیتـوانی بە ئاسـتەمیش جـووڵە بکـات. ویسـتم چـاوم بـکەمەوە، پێڵووەکـانم قـورس ببـوون، ترسـێک دایگـرتم، ئەوە یەکەمجـار و دواجـار بـوو بترسـم. زیـاتر هێـزی دایە بەر خـۆی، بـێ سـوود بـوو. ئەمجـارە بـۆ کـۆکردنەوەی هێـز، پەنـام بـۆ قاچەکـانم بـرد، لە دەسـتەکانم پـاڕامەوە. تەواوی ئەنـدامەکانم هاوکارییـان کـردم، ئەو نەفـرەتییە نەبێـت، بیـرم کەوتەوە جارێکیـان زینـدانییەکی خەسـاو یـان ڕەنـگە شـێتێکیش بـوو بێـت، پێـی وتـووم: "ئەو و قرشـی دەریـا وەک یەک وان، تێریـان نەکەیـت، سـەرت دەخـۆن." ئەوم ئەفەرۆز کـرد، وەک هەمیشـە کە وام کرد بوو.

ئەو گـڵەی دەچـوو لە برژانگەکـانتەوە، مزگێنیـی ئەوەی دەدایتـێ، کە توانیـوتە پێڵووەکانـت لێـک بترازێنیـت. لە دەیجـوری ئەو گـۆڕەدا، پـارچە بەردێـک سـەوز دەچـووەوە، هێڵێـک ڕووی بەردەکەی زبـر کـرد بـوو. سـەرنجم لەسـەر هـێڵەکە کـۆکردەوە. بینیـت نووسـراوە: "ئێـرە ئـاوێنەی ژیـانە، ئـاوێنەیەکی تەواو تەڵـخ، تـۆش دوا مـردووی ئەم گۆڕەیـت، تەنیاییـت باش."

١٩٩٩

# گوڵی مریەم

زایەڵەی هـــاوار و دادی ژنێـــک، وەک لـــورەی بـــایەکی دوور، لە گوێمـــدا دەزرنگێـــتەوە. دەڵێیـــت لە مـــن هەڵـــدێن، دەڵێیـــت لە بـــاران. بیـــر لە مـــردن دەکەمەوە، خۆشـــم دەوێـــت و لێشـــی دەترســـم. ئەم دوو هەســـتە بەردەوام پـــێکەوەن، کەم جـــار ڕێـــک کەوتـــووە مـــن تووشـــی یەکێکیـــان بـــبم و ئەوی دییـــان دیـــار نەبێـــت.. لارەلارو بـــێ حەواس شـــتێک لە موغـــازەیەک دەکـــڕم و ئەو کـــۆڵانە درێـــژە دەبـــڕم، کە کۆتـــاییەکەی لە شـــار و دونیـــایەکی تـــرە و سەرەتاکەشی ئەوەتا لێرە. لە کوچەیەکی پەراوێزی شاری کەرەج.

لە بەردەم دەروازەی ماڵێکـــدا ڕاوەســـتاوم و وەکـــو مریشـــکێک جـــێ بـــۆ چیـــنە خـــۆش بکـــات، دەســـتم لە خـــۆڵی بەر دەرگاکەیانـــدایە.. وەک منـــداڵێکی چەتـــوون خۆڵەپەتـــانێمە، بـــێ مەبەســـت و نـــازانم بـــۆ چ شـــتێک دەگەڕێـــم، کەوا دێـــتە زەیـــنمەوە و زۆر بـــۆی پەرۆش و دامـــاوم. کەســـێک دەرگـــا ڕەشـــەکەی مـــاڵی خۆیـــان بە هێواشـــی دەترازێنێـــت، پیاوێـــک بە چـــاوێکی خەواڵـــوو و زڕاوەوە پۆلیســـانە پرســـیار دەکـــات: "چ کـــار میکـــونی؟" دەســـتم هەر لەخـــۆڵەکەدایە و هـــیچم نەدۆزیـــوەتەوە.. هەڵـــبەتە دەنگـــی ناســـازی بەیـــانی ئەو زرتەپـــۆزە، لە شـــوێنی خـــۆم ڕای چڵەکانـــدووم. ســـەر بەرزدەکەمەوە، هەناســـەیەک هەڵدەکێشـــم، کە لە هەناســـە هەڵکێشـــانی مرۆڤێـــک دەچێـــت دوای زەمـــانێکی زۆر لە چـــاوەڕوانی کردنـــی کەســـێک، بەیـــانییەکی زوو نـــامەیەکی لە کەســـەکەوە پـــێ بگـــات و تێیـــدا نووســـرابێت: "ئیتـــر چـــاوەڕوانم مەکە، مـــن مـــردووم." دەزانـــم ئاگـــام لە خـــۆم نیـــیە، کەچـــی هەر دەمەوێـــت وەڵامـــی ئەو پیـــاوە بـــدەمەوە، کە بە ڕۆبێکـــی خەوتـــنەوە لەبەردەممـــدا

وەســـتاوە و ئەوەتـــا نیگـــام لە قـــاچە تووکنەکـــانی هەڵچەقیـــووە کە لە جووتێـک نەعلـی ڕەشـدا خۆیـان شـاردووەتەوە، سـەرێک بـادەدەم و دەڵـێم: "هیچێ ببخشـە ئاغـا." دایکـت وەک هەمیشـە خەیـاڵەکەت لـێ دەپچڕێنێـت: "ئەوە بـۆ کـوێ ڕۆیشـتوویت بەسـاقەوبم؟ وەرەوە هـۆش خـۆت.. پێـی تـۆ و ئەم شـــارە لە ئەزەلەوە بە قفڵـــێکەوە بەســـتراوە، قەزات گـــرم، تـــۆ لە حەیاتەل عومرتا یەک هەنگاو نەڕۆیشتوویت."

قاچەکـانم دێشـێن، ڕەنـگە هـی ئەوە بێـت مـن زۆر لەسـەریان دەڕۆم.. خـۆم دەزانـم تەواو. ئیتـر مـن مەحکـومم بەم ئـازارە، ئـازاری ونکـردن. دەزانـــیت چـی؟ حەزم نەدەکرد وابم، کەچـــی وامـــــــ..

گەیشـــتوومەتە خیابانێـــک و دەمەوێـــت بـــپەڕمەوە، جارێـــک دەپەڕمەوە و پـــێچەوانەی ئاڕاســـتەی خـــۆم دێـــمەوە ئەمـــبەر، تـــا نیـــوەی ڕێ بـــۆ ئەوبەر دەچـم، پەشـــیمان دەبـــمەوە و دەگەڕێـــمەوە شـــوێنی خـــۆم. بێـــزار بـــووم لەو ئەمـــبەرا و بەرەو خـــۆم یەکلایـــی دەکەمەوە و لەبەرێکیـــانەوە بەتەنیشـــت ڕدێفێـــک درەختـــی کالیپتۆسـدا تـــێ دەپەڕم. لەنـــاو دارەکـــانەوە هـــاوڕێیەکی دێـــرینم، یەکێـــک لە کـــوڕانی گەڕەک، هەروەکـــو ئەوەی بە باڵۆنێـــک دابەزیبێـــتە ئێـــرە، بەرەو ڕووم دێـــت و هێشـــتا نەگەیشـــتووینەتە یەک، باوەشـــمان بـــۆ یەکتـــر کـــردووەتەوە. تێـــر مـــاچم دەکـــات، مـــن بـــێ هێـــزم. لە جـاران گەرموگـوڕ تـر دەکەوێـتە پـێش چـاوم، کەچـی خـۆم لە جـاران شکسـتە ترم. لێم دەپرسێت:

- ئەوە تۆ لە کوێیت؟ لەم وڵاتەدا ماویت؟

بەحاڵ دەمم بۆ لێک هەڵدەپچڕێت، وەڵامی دەدەمەوە:

- ڕاست دەکەیت، وەڵڵا لێرە نیم.. لە کەرەج-م.

- بەخێربێیتەوە.. کەی هاتیتەوە؟

خەریـــکە بڵـــێم زۆر نیـــیە لەم ڕۆژانەدا، کەچـــی هەر زوو بیـــرم دەکەوێـــتەوە، کە من هێشتا نەگەڕاومەتەوە.

- کوا هاتوومەتەوە؟! ئەوە نییە هەر لەوێم..

هاوڕێ دێرینەکەم کە تا ئەوکات دەستی لە دەستم دا بوو، کەمێک فشار لە دەستەکانیدا کەم دەکاتەوە و زۆری نامێنێت، بەتەواوی دەستم بەر بدات، خەندەیەکی سەرگێژکەر دێتە سەر لێوەکانی.

- لەوێی چی، ئەوە تۆ تەواویت؟! ئەوە نییە من و تۆ لێرە قسە دەکەین.. تۆ نەخـــــ

ئەو بەردەوام بوو لە قسە کردن، نازانم لە دوای ئەو دێڕانەوە چیتری وت، کە من سەرنجم لەو سەر و قژە بژ و تێکچووەی دەدا، کە لە هاتنەخوارەوەی لە ئاسماندا وا شەمزا بوو.

دایکم دەرگای هەموو مەرقەدەکان ڕادەوەشێنێت و نزا دەکات کە من چاک ببمەوە و ئەم هەموو شتە پڕوپوچەم بیر بچێتەوە. من بەبێ دەنگ تێرتێر دەگریم و دوعا دەکەم چاک ببمەوە و هەموو شتەکانم بیر بکەوێتەوە.. من لەنێوان بیرچوونەوە و بیرکەوتنەوەدا، تیا مابووم.. خودایە، هێزی فریادێک.

کراسێکی ئاودامان شیرییت وا لە بەردا، هەرچی گوڵی تێدایە، خەنەیی کاڵ کاڵ کاڵە.. گوڵەکان چاوم دیل دەکەن، نازانم تۆ ئەو کاڵییەت جوان کردووە، یان شتە تۆخەکانی ئەم دونیایە هەر وا بە کاڵی جوانن.. کتێبەکەت داخستووە، ڕووسەرییە سپییەکەت کەوتووەتە ملت و بەرەو تارمە خنجیلانەکە دەجمێیت. من لەسەر محەجەرەکان هەڵکورماوم، خامۆش و بێ حەواس تەنها نیگات دەکەم، بە بەردەمما دا دەڕۆیت، ئاوی ئەو لوولە شووشەییە بگۆڕیت کە دوو شاخە گوڵی وا تێدا، وەکو گەنمەموو لە قەدەکانیانەوە ڕەگی ورد و باریکی سپییان لە خۆیان جیا کردووەتەوە. ڕادەپەڕم، وەختە بکەومە خوارێ، بە خۆمدا دێمەوە و لەپشتتەوە ڕادەوەستم، پرسیار لە ناوی ئەو گوڵە دەکەم، داخم لێ دێت کە دەڵێیت: "ئەوانە گوڵی منن." نازانم بۆ هەر لە خۆمەوە، حەزم نەدەکرد گوڵی تۆ بن!

سـالآنێکی زۆر لە ژوورێکـی ئەو باڵەخـانەیەدا بەیەکەوە ژیـاین، شـایەد مـن لەوێش نەبـووبێتم..! خەڵـک دەڵـێن "ئەو کـچە بەتەنیـا دەژیـا.. نیـوەڕوان دوای ئەوەی بەو دەنـگە سـیحراوییەی خـۆی تـیلاوەی دەکـرد، بە ورتەورتێکـی هـێمن، کەم کەم وەک ئەوەی وەڵامـی پیاوێـک بـداتەوە، دەنگی دەبیستڕا" هاوسێکانی وایان دەوت، من ئەمە ناڵێم.

گەرمـا وری کـردووم، بەدرێژایـی ئەو جـادانە ڕێ دەکەم.. تـاک تـاک ئەفغـانییە پەڕاگەنـدەکان نەبێـت، هـیچ مەردومێـک بە دەرەوە نیـیە. دەزانـم بەدوای مرۆڤێکـدا دەگەڕێـم کە عەیـامێکی دوورە ونـم کـردووە، یـان ڕەنـگە ئەو منـی ون کردبێـت، نـازانم! هێنـدە هەیە لکـاوم بە زەوییـەکەوە، پـاش ئەوەی چەنـد سـەد مەتـرێکم بڕیـوە، لەپـڕ وەسـتاوم و بە شـوێنی خۆمـدا گەڕاومەتەوە، نـازانم بـۆ کـوێ بچـم؟ ئـاخر قـورس تـرین شـت ئەوەیە تـۆ بەبـێ ئەدرەس بەدوای کەسـێکدا بگەڕێیـت، کە نازانیـت کەی و لە کـوێ ونت کردووە..

چی بڵێم؟ قەدەری من وایە کە دەبێت مریەم بدۆزمەوە.

هاوسـێکانی ئێسـتا ئەو مێژوویەیـان لەیـاد نەمـاوە، کە ئەو تێیـدا هـاتووەتە ئەم کـوچەیە، بەڵام هەموویـان ئەوە دەڵێـنەوە کە "لە ڕۆژێکـی بـارانی پـڕ تەڕ و تووشـیی دا هـات." کە چـوومەماڵیـان، سـەرم لەو هەمـوو شـتە سـەیرە سـوڕما؛ مۆبیـل، تەپڵەکەکـان، گوڵـدانە خـاڵییە سـەمەکییەکە، بۆیـاخی شـینی دیوارەکـان و لەو تـابلۆیەی ماسـییەک تیایـدا خـۆی لە تۆڕێـک ڕزگـار دەکـات، کە بە دەسـت پیـاوێکی پیـری نـوورانییەوە لە بەلەمێکـی خنجـیلانەدا و هەموشـیان وەکـو خاڵێـک دەردەکەون لەنـاو دەریـایەکی بـێ سـنوور شـیندا. قومێـک لە ئـاوەکەم خـواردەوە، کە لەسـەر سـینییەکی درێژکـۆلانەی شێوەماسـی بـۆی هێنـابووم. هەرگیـز مـریەم جـگە لە ئـاو، خـوردنەوەیەکی دیـکەی نەدەخـوداردەوە. ئەو تـاقە میوانەشـی کە مـن بـووم و جارجـار ڕێـم دەکەتە ئەوێ. جـگە لە ئـاو، هیچی دیکەی پێشکەش نەکردووم.

شەوێکی باران، دەربارەی ئـاو قسەمان زۆر کرد، ئەو کچە شتی سەیر سەیری لەسەر ئـاو دەوت، دەیگوت: "ئەگەر تینوێتی زۆری بۆ نەهێنابامایە، هەرگیز ئـاوم نەدەخواردەوە.. حەیفە ئـاو بخۆیتەوە، ئـاو بۆ ئەوە باشە لە جامێکی شووشەی بکەیت و بینووسێنیت بە پێڵووەکانتەوە و تێر سەیری بکەیت. تۆ وابکە، بزانە چی دەبینیت. ئـاو شتی زۆر دەڵێت، بەڵام دەبێت ڕووی بدەیتێ، دەبێت هەوڵ بدەین لەگەڵ ئـاو ئاشت ببینەوە.. ئەگەر کچان ڕێگەم بدەن، ئەوا دەڵێم: پیاو دەبێت بڕوات لەگەڵ ئـاو خۆشەویستی بکات.. ئۆهـ خودایە.. کاک ئەسمەر تۆ نازانیت خەوتن لەگەڵ ئـاو، ڕاکشان لە دەریادا چەند خۆشە." بەحاڵ خۆمم بۆگیرا، وەختە بوو ئەو هەموو قاقایەی لە قوڕگمدا یەخسیرە، بە یەک جار بەری بدەم. بێ یەک و دوو زیز دەبوو، ئەو کچێک نەبوو، جەسارەتی ئەوە بکەیت بە قسەکانی پێ بکەنیت، دەربارەی هیچیش نا، دەربارەی ئـاو.

ئـاوا بوو، ئەو شەوە بە منی دەوت: "چیت داوە لە کاغەز؟ بڕۆ موتالای ئـاو بکە، سەعی بکە ئـاو بنووسیتەوە، ئەوە پلەیەکی گەورەی ئیمانە.. لەم شەوەوە دەست پێ بکە، هیچ کاتێک بۆ دەستخستنە ناو دەستی ئـاوەوە درەنگ نییە، بڕۆ خۆت هەڵبکێشە لە ئـاو.. لەژێر ئەو بارانەدا ڕابوەستە تا دەخوسێیت، ئـاو ئەو دڵە ڕەشەت نەشواتەوە، چاک نابیتەوە." وەکو عاریفەیەک دەدوا: "ئـاو ئەگەر لە شوێنێک مەخلوق بێت، لە شوێنێکی تـر، لە شوێنێک کە دەبێت پێی بگەین، خالیقە.. خالیق." من هێشتا سەیری ماسی ناو تابلۆکەم دەکرد، کە تا ئەوکاتە نەکەوتبووە ناو ئـاوەکەوە.

پیاوێکی بەدلەشین تێم دەخوڕێت، لێی تێ ناگەم، وا بزانم بە فارسیی قسە دەکات، من پێ کەنینم دێت. تورەبوونەکەی زۆرتر بە سەرزەنشتی باوک و فەرزەندێک دەکات، تا خۆ جیر کردنەوە. بەردەوامە لە بسکویت

بەخشـــینەوە بە باڵنـــدەکان، ئەوانـــیش لە نیشـــتنەوە و فڕینـــان، لەپەســـتدا گوێم لە شەقەشەقی باڵیانە، تۆ گوێت لێی نییە؟

بـاخەوانەکە تـووڕە تـر قسـە بە مـن دەڵێـت، چەنـد دەنـگ بەرز بکـاتەوە، مـن ئەوەنـدەی تـر پـێ کەنیـنم دێـت، وا هەسـت دەکەم دەیەوێـت بەو گەرمیـیەوە ئەحـواڵ پرسـیم بکـات.. بیـرم دەکەوێـتەوە، شـەوێکی تاریـک پـێم وتـی: "مـن هەمیشـە زمـانی فارسـییم وەکـو زمـانێکی مێیـنە دێـتە پـێش چاو، چەنـدە زرتەبـۆزێکی ناشـیرین قسـەی پـێ بکـات، تـۆ وا دەزانیـت کچـێکەو لەبەر خـۆیەوە وێـرد دەخوێنێـت.. ئەو زمـانە هێنـدەی میهـر تێـدایە کە مـرۆڤ پێـی دەئاخافێـت، بـێ ئەوەی بە خـۆی بزانێـت، ڕووت دەبێـتەوە لە نێرگـۆیی." وا بـزانم ئەو شـەوە پـێم وتـی: "مـریەم زمانەکـانیش وان، نێـر و مـێن، مـن دڵنیام فارسیی زمانێکی مێینەیە.."

پیـاوە بەدلەشـینەکە شـاڵاوم بـۆ دەهێنێـت، لە جێـی خـۆم هەڵدەسـتم، سـەیرم لـێ دێـت بـۆ دانـدان بە باڵنـدە، بـاخەوان پەسـت دەکـات؟! ڕێـگەکە ملـی مـن دەگـرێتەوە و کـۆڵانێکی تـر.. خـودایە ئەم کـۆڵان کـۆڵانە لە دڵـم دەربهێنە، پارچەپارچە بووم.

بەرامـــبەرت دانیشـــتووم، لەو چـــاوە قـــاوەییە گەورانەت دەڕوانـــم، کە وەک حەوزێکـی پـڕ لە ماسـی دەتـوانن ئـارامی بـدەنە مـرۆڤ. هەرچەنـدە دەکۆشـم قسـەکانتم نـایەتەوە یـاد، دایکـم دەڵێـت: "ئەم هەتیـوەی مـن، شـت زۆر لێـک دەداتەوە." نـازانم تـۆ ئەو هەمـوو سـاڵە چیـی تـرت لەگەڵ منـدا وتـووە؟ کەم کەم دێـتەوە یـادم کە تـۆ هەمـوو جارێـک لە گفتوگۆکانـدا وتـووتە: "بەسـە بەڕووتـی سـەیری ژنێـک بکەیـت و شـاهیدی لەسـەر بـوونی خـودا بـدەیت.. زەحمەتـی نیـیە لە پەلـکە گیـایەک، لە تـاڵی درێـژی قـژی کچێکـدا، ئەم هەمـوو سـەبر و وردەکـارییەی خـودا ببینیـت.. مەردوومـی بەدبەخـت تەنهـا ببینێـت ئەو هەمـوو ئـاڵییەی وا لە ڕوومەتـی منداڵێکـدا، ئیـدی هەرگیـز بەتەنیا ڕەش و سپی دانابڕێت بەسەر مەرسەمەی ماڵی خودا دا."

گەڕاومەتەوە، هۆشم بە خۆمە. گوێم لە سەدای ژنێکە لە ناوما وێرد دەخوێنێت، هەڵدەستمە سە پێ، جێ بە خۆم ناگرم، کەڵەم وەختە شەق ببێت. لەوەتەی لێک ونبووین، ئەم دەردەم گرتووە، زیکە زیکێک وا لە گوێمدا هاوسەنگیم تێک دەدات. ئەوەتا لەبەر خۆمەوە هەڵدەدەنوتم، لەخۆڕا لەتر دەدەم.. نا لەم کۆڵانانە نەبوو، خودایە چەند ناخۆشە مەخلوقێک خالقی خۆی ون بکات.

ئەو بەیانییە پرسیم: "ئەو گوڵانە بۆ ناخەیتە ئینجانەیەکەوە؟" کە غەزەبنیگایەکی تێگرتم و بە پێداگرییەوە دەنگێکی تیژ و تۆخی لێوە هات: "ئینجانە؟ ئینجانە گڵی دەوێت، من کە ئەسڵەن ئارەزوویەکم لە گڵ نییە."

وەک هەموو جارێک، ڕێی گفتوگۆکەی دەبردەوە سەر ئاو، دەیگوت: "پێویستمان بەوەیە ئەو چاوە تەڵخانەمان بە ئاو بشۆین، ئیدی ئەوەندە فریوی ئەوە نەخۆین کە ئێمە لە توخمی خۆڵین. ئەوە هەڵەیەکە بە مەبەست یان بێ مەبەست، گێڕانەوە دروستی کردووە.. ئەی چۆن گێڕانەوە وایە، ڕەنگە ماوەیەکی تر وا لە من و تۆ بکات، لە چیرۆکێکدا بەر یەکتر بکەوین و یەکیش نەناسینەوە. من زۆر لە گێڕانەوە دەترسم.. ئەسمەرم، توخمی ڕاستەقینەی مرۆڤ ئاوە.. ئاو."

مریەم دەیوت: "هیچ جێیەک وەک دەریا بەئاشکرا سیمای خودا نیشان نادات، دە برۆ.. برۆ سەیری دەریا بکە، بزانە چیی تیایە.. برۆ بزانە هەرچیی کەشتیوانی سەر ئەم ئەستێرەیە هەیە، باوەڕدارە بە خودا یان نا؟ خودا لە پێش چاوی ئەوانە، شەوێک کە تووشی تۆفانێک دەبن، وا دەزانن خودا ڕقی لێ هەڵگرتوون، ئەوان ئەوەندە نەفامن نازانن کە خودا ڕق پێ نازانێت.. ئەوە جێنیشنی ئەوە لە دەریا کە ناشییانە کارەکانی بۆ ڕا نەپەڕێت، وەختێک خودا بۆ چەند ساتێکی کەم دەریا جێ دەهێڵێت و دێت خۆشەویستی لە دڵی عەبدەکانیدا تازە دەکاتەوە."

ئەو کچە هێندە خودا و ماسی و خودا و دەریا و خودا و ئاوی تێکەڵاو دەکرد، کە من سەرم گێژی دەخوارد، دڵم دەهات بەیەکدا، وەختە بوو بڕشێمەوە.. مریەم هەستی پێ کردم، ئەمەک دارییانە دەستێکی بۆ درێژ کردم، بەڵام هەرزوو دەستی گێڕایەوە. دەبێت ئەوە بڵێم کە بەدرێژایی یەکتر ناسینمان، من و مریەم بۆ تەنها جارێکیش دەستمان بەر دەستی یەکتر نەکەوت، دەیوت: "ئاغای ئەسمەری، هیچ شتێک وەک لەمس سیحرەکان بەتاڵ ناکاتەوە.. واز لە لەمس بهێنە، هەوڵ بدە شتەکان وەکو خۆیان بژنەفیت، بەڵام بە گوێی ڕۆح، بە چاوی دڵ، چیت داوە لە دەست لێ دان..؟!"

دەستیان لێ شت بووم، چاکبوونەوەی من لەودیو مەحاڵەوە بوو. هەندێک ئێوارە وەک بەزەیی پێدا هاتنەوە، دایکم باوەشی پێدا دەکردم و شەلەشەل تا ناو باخچەکەی دەبردم، من زۆر قورس نەبووم. ئاخر شتێکی وام نەمابووەوە تا قورسم بکات، داهۆڵێک بووم بۆ خۆم، وەلێ دایکم تەمەنی زۆری خۆی و قەهری من، وایان لێ کردبوو لە ژوورە شێدارەکەمەوە تا حەوشەکە، بیخاتە نۆرەنۆر و هەناسەبڕکێیەکی توندەوە.

وام لەوێ..

بۆنێکی سەیر لە ئوتاق و خانەی ئەو کچەوە دەهات، بۆنی تەڕی، بۆنی خاکی پاش باران.. دوور لە چاوی ئەو، پڕ بە سییەکانم هەڵمدەمژی، بۆ ماوەیەکی کەم ناوچەوانی دەگرتم، بۆنەکە لە خوێنمدا مێروولەی دەکرد، جەستەم شەلاڵ دەبوو لە خاک و ئاو، خۆمم لەبیر دەکرد. وام دەزانی لێرە نیم.. لەوێ نیم.. قەدەرێک دەکەوتمە دەرەوەی زەمەن، زەحمەت بوو باوەڕ بە خۆم بهێنم کە من خۆمم، ئەوەتا وێڵا و سەرەڕۆ، لە وڵاتێکی تر، لەلای خانمێکی سپی پۆش میوانم.

هێواش هێواش دەکەومەوە سەر خۆم.. ناوچەوانم سووک دەبێت، ئارەقم چین چین وەک ئیسفنجێکی تەڕی بۆش لە حەوشەیەکی فەرامۆشدا،

دەرکــــردووە. دەمەوێــت خــۆم لەو شـــەرمە لا بـــدەم و لەبەرچـــاوی ئەو کـــچە، ئاســـایی بنـــوێنم. ئاگـــام لە تـــریقەیەکە لە دڵـیـــدا. جۆرێـــک لە سەرمەســـتی، لە خۆشـــــبەختیی بـــــردنەوەی گرەوێــــک. ئەم هەنـــدەک جـــارانە نەبانـــایە، مـــن نەمـــدەتوانی بـــوونی ئەو کـــچە لە ژیانمـــدا بســـەلمێنم، ئەوە تـــریقەی دڵـــی ژنێـــک بـــوو، دوای یەقینـــی لە دزینـــی دڵـــی پیاوێـــک، وتـــم: "هـــیچ نییە باشـــم، خوێنم کەمە.. ئـــــاوا جارجار گێژ دەبم."

بـــۆنی ئەو کـــچە، جـــادوویەک بـــوو لە مـــن.. ئەو بـــۆنە لەژێـــر پێســـتییەوە دەهـــات، وەک هـــالەیەکی چـــڕ بە دەوریـــدا بـــوو، مـــن ئێســـتا دڵنیـــام کە ئەو توانیـــویەتی بەو بـــۆنە، مـــن ڕابکێشـــێتە نـــاو جەدەلێکـــی قـــووڵەوە، کە خـــۆی هەنـــدێک جـــار قســـەکەر و گوێگریشـــی بـــوو، شـــەوێک لە قســـەکانیدا وتـــی: "خـــودا بەشـــێکە لە هەمـــوو شـــتێک." ئەمەی وت و وەســـتا، قەیرێکـــی زۆر ڕامـــا، دواتـــر وتـــی: "دەتـــوانین وەهـــاش ســـەیری بکەیـــن کە هەمـــوو شـــتێک بەشـــێکە لە خـــودا." مـــن دەمزانـــی ئەم دوو دێـــڕە، دەتـــوانن دوو مەزهەب، دوو فەلســـــەفەی جیـــاواز بخـــولقێنن. هەریەکەشـــیان باوەشـــێک بەڵـــگە بـــۆ ئایـــــدیاکەیان بهێنـــــنەوە و لە دواییشـــــدا ئیمـــــام و ڕابەرەکـــــانی ئەم دوو قوتابخـــــانەیە، بـــــگەنە ئەوەی نە خـــــودا بەشـــێکە لە هەمـــوو شـــتێک و نە هەمـــــوو شـــــتێکیش بەشـــــێکە لە خـــــودا، بەڵـــــکە وەک مـــــریەم لە دواداوا شـــــەوەکانی پێکەوەبوونمانـــدا، دەیـــوت "خـــودا جەلەجەلالەهـــو هەبـــوویەکی تەواو و کامڵە.. خودا نە شتەو نە بەش."

ئێســـتا کە لەژێـــر ســـێبەری بـــاریکی دیوارێکـــدا چـــیچکەم کـــردووە و ئەم شـــتانە دەهێـــنمەوە یـــادی خـــۆم، پـــێ کەنیـــنم بە خـــۆم و بە خـــودا و بە مـــریەمیش دێـــت.. ئـــێمە ئەو ڕۆژانە خەریکـــی چـــی بـــووین؟! خەریـــکە بـــۆنی مـــریەم دەکەم، ئەگەر یـــادەوەریم فـــێڵم لـــێ نەکـــات، ئەوە خـــۆیەتی، بـــۆنی ئەوە.. دەکەومە هەڵەکەســـەما، خـــۆم نـــاگرم، ڕووە و بـــۆنەکە دەڕۆم بـــۆ ئەوســـەری کـــۆڵان، بـــۆنەکە لەم ســـەرە، خـــۆم دەگەیەنـــمەوە ئەم ســـەری کـــۆڵانەکە.. نـــــا.. بـــۆنەکە لە چەقـــی کـــۆڵانەکەوە دێـــت، ڕادەکەم بـــۆ ناوەڕاســـتی

کـــۆڵان. دوو ژن بە ڕێبـــواریی تـــێ دەپەڕن، لەودیـــو چارشـــێوەکانیانەوە دەســـتیان خســـتووەتە ســـەر دەمیـــان، دەزانـــم بەو ڕاکەڕاکەی مـــن پـــێ دەکەنن.

مـــریەم کەم جـــار پـــێ دەکەنـــی.. غەمێکـــی قـــووڵ لە چاوەکانیـــدا بـــوو، زۆر کاتـــان باڵاپۆشـــێکی ســـپی دەپۆشـــی، پێســـتی دەســـتەکانی گـــرژ ببـــوون، بەئاشـــکرا ئەوەیـــان دەوت کە ئەم کـــچە تەمەنێکـــی کامـــڵ ژیـــاوە. مـــریەم لەو کـــچە دەگمەنـــانە بـــوو کە مـــرۆڤ ڕێـــگەی بە خـــۆی نەدەدا، لە تـــێ پەڕینیـــدا لەبەری هەڵنەســـێت. کچێـــک قورســـاییەکی ســـەیر لە ڕۆیشـــتن و لە جـــووڵە و لە قسەکردنیدا هەبوو.

لە ناوەڕاســـتی کـــۆڵانەکەدا ئەمـــبەرو ئەوبەر دەکەم، بـــۆنەکە لە ئـــاجوری دیوارەکـــانەوە دێـــت، پێـــوپلم لە دیوارەکـــان هەڵدەســـووم، هەســـت بە زبـــری نـــاکەم، کەچـــی ئەوەتـــا چنـــگ و پـــۆم پڕبـــووە لە خـــوێن.. بـــۆنەکە دەچێـــتە درەختـــی بەرماڵەکـــانەوە، پیایانـــدا هەڵـــدەزنێم. بـــۆنەکە لەنـــاو گەڵاکانـــدا پەنگە و دەرناچێت.

نم نم باران دای کردووە..

بـــۆنەکە دەکەوێـــتە جـــووڵە، لقـــا ولـــق وەک منـــداڵێک شـــوێن خـــۆیم دەخـــات. زۆری نامێنێـــت لەســـەر بەرزتـــرین چـــڵەوە فـــڕێم بـــداتە خـــوارەوە، وەک دڵ پـــێ ســـووتان، وەک پەشـــیمانبوونەوەیکی خێـــرا، بـــۆنەکە دێـــتەوە نـــاو گەڵاکـــان و بەلای شـــانمدا فـــرتە دەکـــات. ئـــــاخر بەو دەســـــتە خوێناوییـــانەوە بـــۆم ناگیرێـــت، بارانـــاکە پـــێ هەڵـــدەگرێت.. لەنـــاو گەڵاکانـــدا بەدوای ئەودا ونـــم، کەچـــی هەر تەڕم دەکـــات.. بـــۆنەکە ناســـرەوێت، بە درەخـــتەکەدا دێـــتە خـــوارێ، بە درەخـــتەکەدا دێـــمە خـــوارێ، بـــۆنەکە چـــووەتە زەوییـــەکەوە و بـــارانەکە بـــووە بە شەســـتە.. خـــۆم بە زەوییـــەکەوە نوســـاندووە، بـــۆنی دەکەم.

بـــارانەکە ڕیـــتمەکەی خـــۆی خێراتـــر کـــردووە و مـــن چـــنگم کـــردووە بە خـــاکەکەدا، بـــۆنەکە بە زەوییـــەکەوە نوســـاوە و مـــن لەژێـــر بـــارانەکەدا

خوســاوم.. بــۆنەکە قــووڵتر دەچێــتە زەویــیەکەوە، ســەرم دەجــووڵێنم بە شــوێنیدا دەگەڕێــم، دەی دۆزمەوە. بــارانەکە دەڵێیــت هەر بەســەر منــدا دەبارێــت، تەڕ تەڕ تەڕم دەکــات.. بــۆنەکە ون دەبێــت و مــن قەپــم کــردووە بە زەویــیەکەدا.. گــوێم لە شەپەشــەپی چارشــێوی ژنەکــانە، نــازانم لە ترســی مــن ڕادەکەن یــان لە ترســی بــاران، وەلــێ دەزانــم یەکیــان هــاوار دەکــات "یـــــــا ئەلــی..!! یـــــــا ئەلــی..!!"

٢٠٠٥

# به ڕێگاوەم بۆماڵەوە

ئەمەوێ بنوسم (پیاوێک لە تەم دا دەمرێ) ناینوسم!

مــن نــازانم ئەم بــاخە چــی لە مــن دەوێــت، هەمــوو ڕۆژێ ئەوەنــدە دێــتە مــنەوە.. ئەوەنــدە دێــتە مــنەوە.. ئەوەنــدە دێــتە مــنەوە.. ســەرم گەڵای گرتــووە، لە قــاچمەوە دەزولەی بــاریکی ســپی چنــگ لە عەردەکە گیــر دەکــات.. بیــر لە فــڕین دەکەمەوە.. قــاچە کیــڕەمە، خەریکــم کاشــییەکەی ژێــر پــێم هەڵ ئەکــۆڵم.. قەلەقــم.. حەزدەکەم جــوێنێ بــدەم، ئایــا دەتــوانم؛ ئەو هەمــوو چاینــایە ئەڵێــی گــای ئیســپانیایە لەبەر چاومــدا.. ئەو هەمــوو سوورییە چییە لە ڕەنگیاندا..؟؟ یەک دەقە بووەستن چاوم دەفرێ.

بــاوکم ڕیشــە ســپییەکەی دەخورێنێــت و ئەڵــێ کــوڕم، تیــرێ کە لە کەوان دەرچــوووو..... مــن شــەرم دەکەم لە میهــری و لەدڵــی خۆمــدا دەڵــێم بــاوکە ســەری مــن نیشــانەیە بــۆ ئەو تیــرەی لە کەوان دەرچــوو، بــۆ ئەو تیــرەی لە کەوان دایە، بۆ ئەو تیرەشی هێشتا نەچۆتە کەوانەوە..

زەردێکــی زبــرم وەک مانــگ لە تــابلۆیەکی ڤــانکوخ دا.. ئەم زنجیــرە بــۆتە هێلێکــی ڕەش و چەمــاوە لە ملــم دا و ســەرم بــووە بە کــۆترە بــاریکە.. وەک دوا خواحــافیزی گمەگمێــک دەکەم.. هەمــووان واقیــان وڕمــاوەتە مــن.. لەچــاوی پــڕ لە ئــاوی ئەوانــدا تەکانێــک دەدەمە خــۆم و لەدڵەوە نیــیەتم هێنــاوە (لە ڕاســتیدا مــن دەمــێکە ئەم نیــیەتەم هێنــاوە!) بــاڵ دەکەمەوە..

کەس قســە نەکــات مــن دەفــڕم.. لە یەکەم شــەقەدا لەو ئاســمانە دەبــم بە تــۆپەڵێک گــڕ.

شــەختە ئەبــارێ دیســـان، وابــزانم هەر بەســـەر ســـەری منـــدا.. ســـەرمامە.. خەیـــاڵ لەســـەرمدا دەیبەســتێ.. ســـەرم ســـوورِ دەمێنــێ.. ئەرێ کەســێک نیـیە ئەم هەمـــوو ســـەرمایە بچێـــتە نـــاویەوە مـــن نەبـــم..؟! مـــن عـــومرێکە لەم زەمهەریرەی خۆمدا هەڵ ئەلەرزم و سەرمای وا بێ شەرەفم نەدیووە..

ســـێبەرەکەم زنجیـــری پانتـــــــــۆڵەکەی دەترازێنـــێ.. ڕوو دەکەم بەودیـــودا، ئەم دەرگـــــایە دەکەمەوە و ئاشـــــنایت لە تەک دائەخەم... مـــــن لەم دەروازە تـــون و تاریـــک و قەتیســـەت دا گیـــرم کـــردووە.. گـــوێم لە خـــورە خـــورێکی هێواشـــە.. بـــێ دەنگـــی چـــوون قەحـــبەیەک خـــۆی خزانـــدۆتە باوەشـــم، منـــیش مەیلـــم لێیەتـــی.. پـــاش قەیـــرێ، ئـــاورِ دەدەمەوە و ئەڵـــێم ئەهـــا ســـەیرکە؛ عەکسی قەمەر چەند لیخنە لە حەوزی من دا.

ئەبـــێ بچـــمەوە بـــۆ مـــاڵەوە هـــۆمۆرک خـــواردوومی؛ مـــن ســـێ ئیشـــی گـــرنگم هەیە، خـــۆت دەزانـــی: ئەبـــێ بیـــر لە تـــــــــۆ بـــکەمەوە.. ئەبـــێ بیـــر لە تـــــــــۆ بـــکەمەوە.. لە ســـێیەمدا دەبـــێ ئاگـــاداربم ئەرکەکـــانی یەکەم و دووەمـــم بە ئیخلاســـەوە و لە تـــوێی دڵەوە کردبـــێ.. نـــــــا خۆشەویســـتی وەزیـــفە نیـــیە.. خۆشەویســـتی ئیشـــی خـــۆمە.. نـــامەیەک دەنوســـم بە ئـــاو نـــــــا، بتکا بەخوێن.. ئاوا دەستپێدەکەم

"IHANA KULTANI"*

دنیـــا دەکەم بە نـــور بە کاکێشـــانە دوورەکانیشـــەوە... ئەڵێـــی چیـــی، چنگێـــک تیئێنتـــی بخـــۆم و مـــن نـــــا، خۆشەویســـتی بتەقێـــتەوە..؟ مـــن ئەبـــێ بـــڕۆم.. ئەبـــێ وەک تارمـــاییەکی ســـپی بەنـــاو تەمێکـــی شـــین، بەســـەر دەریـــای ڕەش دا بـــڕۆم.. (شـــادی) ئەڵـــێ تـــــــــۆ ئەم قەلەقیـــیەت بـــۆ ئەوەنـــدە قەلەقە، بـــۆ نـــاچی قســـەی دڵتـــی بـــۆ بکەیـــت؟ بەڕێنوســـێکی هەڵە بـــۆی ئەنوســـم؛ نـــوکتە نـــوکتە نـــوکتە.. نـــــــا ئەنوســـم ئـــاوا مەزانە کە لە دڵـــــــمدا جێـــی بـــۆتەوە..

* ئەمە وشەیەکی فنلندییە بە مانای (شیرینەکەم) دێت.

بەقەد زەوی قـورسـه ئەم بـاره .. وەڵاهی لـو أنزلنـا علـى جبـل لرأيتـه خاشـعا متصدعا لەسەر كورسييەک لەم باخەدا دا ئەنيشم.

- عەرزەكە ساردده .. هەستە.

هەڵ دەسـتم، بەقـووڵی بیـر له خـودا دەكەمەوه، لەسـەری خـۆم نـا، لەسەری ڤیتگنشتایندا.

ئەبـێ بـڕۆمەوه بـۆ مـاڵەوه، مـن لەم دڵه خـراپەی خۆشـمدا پـەناهـەنـدەم*** زۆرناخۆشـه تـا كۆتـایی مـن هەمـوو قسـەكان بـكەم.. حەیـف لێـره نیـت..! ئەزانـی بەڕاسـتی لـێم تێكچووه سـەرم، مـن (ز)ی زمـان بە زەهـر دەنوسـم، خـۆ غەڵەت نیـیه غەڵەت بـكەم؟ ئەم ڕۆژانه حەزم لەم ناونیشـانەیه بـۆ وتـارێكم: (پەیوەنـدی نێـوان هەڵه و چێـژ لای واڵتەربنیـامین؛ فیگـۆری ئـادەم بە نمـونه) ئەم زمانـانه تـاڵن له زارم دا، لەگەڵ دایكـم بە ڕوسـیی قسـه دەكەم، له گـروپ بە فارسـی، كه ئەچـم شـەراب دەكـرم بە فرانسـی، بەس بـاقڵم، بـاقڵم مـن بە كـوردی بیـر له تـۆ دەكەمەوه.. نـا تـۆ نـامومكین نیـت، تـۆ دەسنەرەسەیت.

ڤیۆلـۆن چیـیه؟! مـن سـۆلۆیەک دڵـم ئەڕۆم.. لەم چـاخی ڕاپەدا، مـن وەک سـۆفییەكی پیـر خۆشەویسـتی دەكەم.. تـۆش كەیفـی خـۆته..! شـوێنێكت دەگـرم (مەترسـه دەسـتته) له دڵەوه حەز دەكەم؛ شـتێكت تێـدا زینـدوو بـكەمەوه بتبـاتەوه سـەر خـۆت.. له خـۆت بچـی.. تكـا دەكەم تـۆ شـتێكم تێـدا زینـدوو بـكەرەوه نەمبـاتەوه سـەر خـۆم و له خـۆم نەچـم..! مـن دوو سـوێند دەخـۆم؛ له شـوێنێكی تـریش دا تـۆم بینیـووه.. ئەوه كویـا بـووم؟! له فەخفـورییەكی چینـی دا لەگەڵ خیـام شـەرابی سـوورت دەخـواردەوه.. سـادق هیـدایەتم شـاهیده ئەوه تـۆیت.. سـوێند دەخـۆم.. سـوێند دەخـۆم.. سـوێند دەخـۆم بیركردنەوه له تـۆ سەریەشەیه..

---

*** دێره شیعرێكی شاعیری شەهید (بەكر علی) یە بە دەستكارییەوه.

واووو.. دیسان..!!

هەمیشە کە ئەنوسی دەبێ بەشتێکی تر، من نەم ئەویست ئەمە بنوسم.. وا بزانم خیانەتەکان هەموویان لە سەردان، بەس دەست دەیانکات.. ئەوەتا بەسەر سەری مندا باران دەباریێ، دڵم تۆی دەوێت، حەزدەکا لێرە بی.. لەبەر ئەم لێزمەیەدا دەستت بکەیتەوە.. لەپێت پڕببێ لە باران، بەقەت ئەو دڵۆپانە نا کە دەکەونە دەستتەوە، بەقەت ئەو دڵۆپانەی ناکەونە دەستتەوە خۆشم دەوێیت.[·]

ئەبێ ڕاکەم.. هەناسە بڕکێمە.. سنگم توندە.. چکەچک مەراقم لێ دەچۆڕێ.. بە پرتاو خۆم ئەکێشم بەدەرگای ماڵەوەدا.. لەژوورەوە قسەم بۆ ناکرێ.. قسەم بیر چۆتەوە.. دەستێکم بەناوچەوانمەوە و دەستێکم ڕادەکێشم.. وەک لاڵێک تێکەڵ لە پاڕانەوە و داوا ئەڵێم دایکە.. دایکە دەرگاکە داخە.. دەرەوە تاعوونە.. تاعـــــــــــوون...[*]

٢٠١٠

[·] خەیاڵی ئەم دێڕە، زۆر نزیکە لە دێڕێکی هاوڕێی چیرۆکنوسم (باران).

[*] دوا دێڕی ئەم تێکستە، دیالۆگی کاراکتەرێکی بەختیار عەلی-یە لە ڕۆمانی (دواهەمین هەناری دونیا)دا.

# سەگێک بێ تاقەتە... زۆر!

خـــۆش خـــۆش لە پێشـــییەوە دەڕوات و ئەوی شـــوێن خـــۆی خســـتووە، ســـەگێگ ژنێکـــی بـــۆ پیاســـە بـــردووە، مـــن ســـەیری شـــینایی دەکەم.. لێـــرە نـــیم.. تەنیـــایی هەڵـــی پێچـــاوم، قـــولەپێمی گرتـــووە، ســـەیری دەکەم پـــێم دەوەڕێ، گەمـــاڵێکی خـــرپنە، چـــاوی لەســـەر قەتـــیس دەکەم، ژنەکە گەشـــکە دەیگرێـــت وادەزانـــێ مـــن بیـــر لەســـەگەکەی ئەو دەکەمەوە، شـــتێک دەڵـــێ.. دەزانـــم فـــزولییەکەت لـــێ نـــاگەڕێ و ســـەرم کـــوون دەکەیـــت، ئەگەرنـــا بـــۆم نەدەکردیتە کوردی.

لە ئیمەیلێکـــدا بە دلاوەر دەڵـــێم "ئوســـتاز.. غـــوربەت چـــۆن تایـــپ دەکرێـــت؟ بـــۆم بنووســـە.. خـــۆت دەزانـــی مـــن لە ئـــیملادا کـــۆڵم" دەروێشـــێک لەو ســـەهۆڵبەندانەوە بـــۆم دەنووســـێت "ئـــازیز.. تـــۆ بـــۆ وا دەکەیـــت؟ بـــۆ ئەوەنـــدە خـــۆت هەڵ دەکۆڵیـــت؟" ئەو نـــازانێ مـــن لە ســـوبحی ســـاڵحانەوە لە ئەڵمـــاس دەگەڕێم و مەغریبان بەلا سەردەخەم..!!

بیـــر لە لـــێ بـــوونەوە دەکەمەوە.. لـــێ بـــوونەوە.. لـــێ بـــوونەوە.. مـــن وەک لـــێ بـــوونەوەی قەیرەکچێـــک لە خـــوێن لـــێ بـــوومەتەوە و هێنـــدەش پێـــی دڵـــتەنگم.. ئەم هەمـــوو ژنە چیـــیە بە منـــدا دێـــن، مـــن چـــیم بەم هەمـــوو ژنەدا دەچـــم..! نەگبەتـــی گرتـــوومی و حەز دەکەم میـــز بـــکەم بە ســـەقفی ژوورەکەدا.. بـــۆم نـــاکرێ! وەک پیـــاوێکی هەرزان لە مەیـــدانی چەرچییەکـــانم، گێژەگێـــژ دەکەم کە دەبیـــنم جـــاڕچییەک پـــاش قەیـــرێ وردبـــوونەوە لەمـــن لەپـــڕ هـــاوار دەکـــات: "پیـــاوێـــک بـــۆ ســـــکـــراب".. تـــازە هـــیچ.. هەڵـــم وەشـــێنە.. ئەو

هەمــوو پــارچەیەم کۆنــابێتەوە.. چــیم لــێ دەکەیــت؟ قــاچم وەک داهۆڵێــک بچەقێــنەوە چیرۆکێکــی شــێرزاد.. ســەرم بەدەمــدا (تکــایە بەدەمــدا سەرەونخونبکەوە نێـو سـیفۆنی ئاودەسـتێک، بـۆنی ئەوێ گەلەک.. گەلەک لە سیاناوی ژیان خۆشترە.

تــاقەتی ڕاســتکردنەوەی ڕێزمــانم نیــیە، ژنەکە هەر ئەوەنــدەی وتــووە: (ســەگ بێتــاقەتە.. زۆر) باوێشــێک دەدەم کە ژنەکەم لە تێلەفۆنــدا دەڵــێ "بـا ئەوەنـدە پـێ نەکەنـین، پێکەنینمـان پێـوە نـایە"! مـن قاقـای نائومێـدی دەکێشـمو بەکـچە بەقـاڵێکی ڕووخـۆش دەڵـێم تـۆش کیلـۆیەک بەخـتەوەری بۆمن بکێشە، بەس توخوا با جوانبێت بۆ زەلاتەم دەوێت.

تاســـەرم دەڕوات دەڕۆم.. تـــا قـــاچم عەرد دەگـــرێ دەگەڕێـــمەوە، ئەم ڕۆیشـــتنو گەڕانەوەیە لەتیــان کــردووم.. هەڵــتڵــیشـــــام.. لە دڵەوە حەز دەکەم بەشــی گەڕانەوەم فــرە تربێــت، کەچــی ئەفســوس هەمیشــە تــای ســەرهەڵگرتنم قورســت تــرە.. مــن وەک ســەگێک ســەرم کزکــز بــاوکم دەڵــێ "بڵــێ حیــز حیــز" کــردووە.. بەم حەمــکە جــادەیەدا دەڕۆم، ئەو هەمــوو جـادەیە بەمنـدا دەچـێ. چـاوم دەفـڕێ و کەسـیش نیـازی هـاتنی بـۆ لای مـن نیــیە، مــن لەیەککاتــدا خــانەخوێیەکی بــێ میــوان و میــوانێکی بــێ خــانەخوێم.. لەســەر ئــاوازی گــۆرانییەکی مــاملێ فــیکە دەکێشــم و بەم جــادانەدا لەنــجە دەکەم.. هەرچەنــد تاقیــدەکەمەوە ئەم وڵاتە تەســکە بە بەرم و تەنگە بە پێم...

خــۆی و ســەگەکەی مــن و تەنیــایی، ئــێمە هەر چوارمــانین.. بەدرێژایــی ڕۆژ لێــرە بــاران دەبــارێ، دەڵێــی خــودا هەرچــی ئــاوی هەیە دەیکــاتە نێــوگەڵی ئەم مەلەکەتەوە.. بەســەر تەلێکــی دڕکاویــدا ڕاوم دەنــێن، تەلێکــی دڕکــاوی بەجەســـتەی منـــدا ڕا دەکێشـــن.. جـــوێن بە تورکومانســـتانیش دەدەم.. بە قەفقازســـتانیش.. بە ئاســـیای دوور.. بە شـــارەکەی خـــۆم..! حەز دەکەم تـــا ســـکەی ئاســـن دەڕوات جوێنـــت بـــۆ حەواڵە بـــکەم.. تـــا ئاســـمان هەیەو وەک زەردەواڵەیەکــی قــورس فــڕۆکە گێژەکــانتی پیــا دەفــڕێ، تفــت بــۆ پۆســت

بکەم.. ئەملاو لای خۆم ماچ دەکەم کە لەوێش بووم لەلات.. وشیاریم کۆمەکی کردووم بزانم تۆ شارنیت.. تۆ قەحبەیت.

لە دەم پیسیم عەفوو بفەرموو، بەڵام تۆ نا! خودایە تۆ نا.. تۆ لێشم خۆش ببیت، من لێت خۆش نابم .. بابمێنێ.. ڕۆژێک من و تۆ حسابی خۆمان پاک دەکەینەوە، دەزانم هەر ئیشمان دەکەوێتەوە یەک.. تۆ دەزانی من چوارشەموان سەفەر دەکەم، هەینیان دەچمە کڵێسا و داوای شەراب و نان دەکەم، نیوەڕۆی یەکشەممان لەپشت مەلایەکی گەورەوە نوێژی جومعە دەکەم، زانیاریم لەسەر جولەکەکان زۆر کەمە، ئەگەرنا ڕۆژانی شەممە دەچوومە قودس و لە تەنیشت دیواری پیرۆزەوە دیلانێم بەخۆم دەکرد و دوعایەکم دەخوێند.. دوعایەک کە هەر خۆم دەمزانی چیم دەخواست.. دووشەممە و سێشەممە هیچ ناکەم دەست دەنێمە ژێرسەرم و لەسەر ئەم جادانە دەخەوم.. تۆ قەت سێ ڕۆژ لەسەر یەک خەوتویت..؟

ئێستا ساڵی ١٥٦٧ـە، سوڵتان لەئەستانەوە لەگەڵ (قەدی سەیفوڵڵا ئەفەندی)و دەستەیەک میرزای وڕ و پۆلێ میئماری گێژدا ناردوومی بۆ ئەم شارە تا مزگەوتێک دروست بکەم، مزگەوتێک کە دوای پێنج سەدەی تر ئەولادەکانی شار سێکس لەبەردەرگاکەیدا بکەن و خوداش نەتوانێ فزە بکات.. کە سەیری سەدەکانی ناوەڕاست دەکەم، دڵم بۆخودا دەسوتێ ئەو ڕۆژانە زۆری ئیش هەبووە، ئێستاش وەک پیرێکی خانەنشین چەند بێ ئیشە، دروست وەکو ئەم بەندەیەی خۆی.. خودا چەند تەنیایە من، من چەند تەنیام خودایە.

ژنەکە لەسەگەکەی زیاتر خۆیم تێ هەڵدەسوێ و لەویش زیاتر بۆنم پێوە دەکات، کەچی من لە عەکسێتیمدا زۆرتر دڵم لەسەر حەیوانەکەیەتی تا خۆی.. وەختێک دەزانم پەتەکە لەملم توند ببووە.. خەریکە دەخنکێم.. سەگێک من کێش دەکات و ژنێک تەنیایمی لەگەڵ خۆی بردووە.

هەمـــووان دەخـــوازن منـــداڵێک بـــخەنەوە و مـــن لەمنـــداڵێک ڕادەکەم، ســـەرمامە شـــەق لە هەرچـــی کـــونی دونیـــایە هەڵ دەدەم بەکـــونی بەرمۆداشـــەوە، هەر لەخـــۆمەوە وا هەســـت دەکەم کونەکـــان هـــی تـــێ چـــوون نـــین! هـــی گیـــر خواردنن..!

دیسان لەسەر جادەم..

بـــای ســـاردی ئەم شـــارە دەمبـــاتەوە پـــۆلی ســـێی ســـەرەتایی جـــاران، ڕەحـــلەیەک پـــێش ئـــاخیر خـــۆمم، وەک هەمیشـــە لای پەنـــجەرەوە، ئەگەر هەر نەتـــدۆزیمەوە بلوســـێکی خـــوری شـــینم وا لەبەردا دایکـــم خـــۆی چنیـــوێتی بـــۆم.. وەک ئەوەی پێشـــهاتی پیـــاوێکی خـــواری* لـــێ کـــردبێتم، هەرخـــۆی بەدەســـتو خەتێکـــی خـــوار، بەشـــلیلەیەکی پیرۆزەیـــی لەســـەر پشـــتمی نوسیووە (تـــوانـــا).

وانەی زانســـتە؛ بـــێ دەســـت هەڵبـــڕین هەســـتاوم و دەرســـەکەم بە مامۆســـتا بڕیـــوە.. ئەلـــێم "ســـت ئەڵـــوەن.. بەقورئـــان کەڕوو تەنهـــا لەســـەر شـــتی شـــێدار نـــاژی" ئەڵـــێ ئەی ئەفەنـــدی کەڕوو لەســـەر چـــی دەژی؟.. چـــاوم پـــڕ بـــووە.. دیســـانەوە قـــورگم گیـــراوەتەوە.. پچڕپچـــڕ قســـەکەمی بـــۆ تەواو دەکەم: "مامۆستا گیان..

کەڕوو لەسەر من.. لەسەر م..ن.. دەژی.. لەسەر من".

کـــێ ســـەلیقەی ئەو هەمـــوو گـــوێگرتنەی هەیە لە خـــۆی.. مـــن یەک MP3 قســـەم پێـــیە بـــۆ خـــۆم.. خەریکـــی چیم؟.. لاسـایی خـــۆم دەکەمەوە و لە دڵەوە چەمـــۆڵە لە خـــۆم دەنـــێم.. نوقتەکـــانی ئەم نوســـینە تـــۆخ دەکەمەوە و هەســـت دەکەم ئیتـــر هـــیچ ئیشـــێکم نە لێـــرەو نە لەوێ و نە لەم دونیـــایەدا نـــیە.. مـــن نـــازانم چـــی دەکەم.. نـــازانم بـــۆ هـــاتووم..؟! دەســـتم گیرکـــردووە لە ناوچەوانم و سەرم دەکوڵێ.. نامەوێ هیچی کە بڵێم.

٢٠٠٩

ســـۆفـــیـــا

*** پیاوێکی خوار: ناوی چیرۆکێکی ئیسماعیل حەمەئەمینە.**

# موعتادێک لەسەر پردی سیرِات

یوسف نیم و وام لەم بیرە تاریک و قوولەدا، کەس نەی خستوومەتە ئێرەوە، خۆم هاتووم.. زەحمەتی دەرهێنانم مەخەنە بەر خۆتان، ئەگەر ئەرک نییە سەری ئەو بیرە داپۆشن، ئەو رووناکاییە عەزێتم دەکات.. لەناومدا بەفر دەستی پێ کردووە؛ کرێوە دەکات، هەموو هەناوی سارد و سپی، کرِ وکپ کردووە. لە دوورەدەست سەگێگ دەقرِوسکێنێت، دادەچلەکێم بۆ ئازاری جێ بەردێک بە ئەژنۆی چەپییەوە. ئەمشەو تا بەیانی بەدیار کەروێشکێکەوە دادەنیشم کە ئازاری گوێ ئێشە ئارامی لێ بریووە، تاوناتاوێک دوکەڵی جگەرەکەم دەکەم بە گوێیدا و پێی دەڵێم هەبێت و نەبێت دەنگی بەرزت بیستووە. منیش وام، بە دەنگی بەرز گوێم دێشێت، هەربۆیە بە چپە لەگەڵ خۆمدا قسە دەکەم.

منیش وەک فرۆغ بەم نائومێدییەی خۆم موعتادم.. بیرم دەکەوێتەوە رۆژێک دەوەستم، بۆ ئەو رۆژەی خۆم دڵتەنگم.. خەریکی رەشنووسی نامەیەکم بۆ پاپای باخ.. لە جێیەکیدا نووسیومە "جەناب عالی، لێگەرِێن ئەو خەڵکە بە دڵی خۆیان بژین، ئەوەندە ئینسان لەیەک مەکەن بە دوژمن، خوێنی براکان هێشتا بە کەڵبەی یەکترەوە دڵۆپە دەکات.." هاوپێچ وێنەیەکی ئەو نامەیە دەنێرم بۆ مەرجەعی بالآی دەمەشێر و شێخی نازناز.

بیری ئیستانبووڵ دەکەم.. بیری پشکۆ.. تاسەی پیاسەیەک بە قومقاپی و سوڵتان ئەحمەد دا.. سەرم لەو دەرگا زەبەلاح و پەنجەرە بچووکانەی

سووڕ دەمێنێت، دەست دەنێمە بناگوێ نا دەست دەهێنم بە پشتی ئەو پشیلە خرپنە ئاسوودانەی، کە بە چەند نەوەیەک دەچنەوە سەر گوربە بۆری سوڵتان.. لە مەیدانی عەسکەر دا، گوێم لە تەقەی ناڵی ئەو ئەسپانەیە کە هاوڕێتم و یەک نەوا، بەسەر گابەردە خوار و خێچەکانی مەیدانەکەدا شاق و شریق خۆیان نمایش دەکەن.

هێدفۆنێک لە ئاغای گوڵکار دەستێنم و بەدەم گوێگرتن لە (ئیلاهی نان)ی غولام حسێن بەنان ـەوە، دووسەد مەتر لە چایخانەی سەهۆڵەکە دووردەکەومەوە. کە گۆرانییەکە تەواو دەبێت، دەمەوێت بە شوێنی خۆمدا بگەڕێمەوە، هەوڵدەدەم قاچ بخەمەوە سەر جێ پێکانی خۆم.. نامەوێت ئەرکی هەڵگرتنی جێ پێکانم بدەم بەسەر کەسی تردا، هەروەک نامەوێت پێ بە کەسی دیکەشدا بنێم.. من هەندێک جار جێ پێکانی خۆم دەناسمەوە؛ ئەوە جێ پێی کچێکی عیشوەبازە.. ئەوە هیی کوڕێکی ناموراد.. ئەوەشیان جێ پێی ئاسایشێکی عەبوسە کە پێکوتە و سەنگین داینناون.. جێ پێکان بە گەورە و بچووکی ناناسرێنەوە! وای بۆ مەچن. جێپێ بە باریکی، قەلەقی، لاری، کورت و پچڕی، نیوکەوانی.. خاوەنەکەی خۆی ئاشکرا دەکات.

من بەم شارە موعتادم، دوعام بۆ بکەن ئەم شارە تەرک بکەم.. ئەمە درمێکی پیسە.. پەتایەکی خراپ.. هەوای ئەم شارە تەنگ و وشکە، هیلاک و شەکەت، حەزدەکەم ماریفەتێک بنوێنم و لە ڕووی هاوخەمییەوە جگەرەیەکی بۆ گڕ بدەم و داوەتی چایەکی بکەم لە سەهۆڵەکە.. سەرمایەتی.. تەزیوم.. تەک دەدەینە پاڵ یەک و پێکەوە پشت دەنێین بە وەجاخەکەوە.. ئەو ئازای ئەندامی تەڕە و من ڕۆحم شەختەی کردووە.. لە بێ نازیدا من و بای ئەم شارە چەند لێک دەچین.

بیر لە توران دەکەمەوە.. لە بەختەوەریی بچووک لەلای پیاوی گەورە، لە ئازاد سوبحی، لەو بێ دەنگی و سکوتە موتڵەقەی، لەبەر خۆمەوە ورتە

ورتــەمە؛ ئەم بــێ دەنگییــانە لە دڵشــکانەوەن، لە هیجــری خەون و وەســڵی نامورادیدان.. ئەمە ژیانە لەناو خەوندا.

"شـێرێک لە منـدا نوسـتووە.."* شـێرێکی مانـدوو، بـێ دەنـگ بـن بـا خەبەری نەبێـتەوە.. ئەوەتـا لەسـەر قسـە کـردن دەوەسـتم، جارجـار چـاو دادەخەم.. بیـر دەکەمەوە ئیتـر قسـە نەکەم.. قسـە کـردن زەرەرێکـی گەورە لە ئینسـان دەدات؛ زەرەری بیــــر چـــوونەوەی خــــۆی.. ئـــێمە لەمەودوا دەتـــوانین ئیشـوکارەکان بە نیگـا ڕایـی بکەیـن.. سـەیری کەسـێک، شـتێک، شـوێنی بکەیـن و ئەو هەسـتێت بێـت بـۆ لامـان.. ئەوە ڕێگـایەکی بـێ ڕتووشـی پەیوەنـدییە لەنێـوان خـود و بابەتـدا.. بە شـێوەیەک ئەو دێـڕانەی کە مـن دەمەوێـت لەمەو دوا بیـانڵێم، بەبـێ ئەوەی بیـان نووسـم، ئێـوە بیـان خوێننەوە. من لە ستاتیکای بێ دەنگی ڕادەمێنم.

دەزانیـت یەک تـۆز ورد ببیـتەوە، ئەم شـارە تەلار و بـاخچە و مـاڵ نیـیە؟! نـا.. بێشـومار جێ پێیە.. جـێ پـێ.. جـێ پـێ.. جـێ پێـی مـن! سـەرم مێـرووڵە دەکـات. بۆگەنێـک لە خـوارەوە دێـت، لە خـواری خـوارەوە.. لە دڵـی ئەم عەرزەوە.. ئەم هەوا تەنـگ و بـۆگەنە یەکلایـیم دەکـاتەوە کە ئەمە شـار نیـیە و گـووە.. گـوویەکی گەورە گەورە، کە مـن تـا بینەقاقـام تیایدا غەرقە. بۆم گرنگ نییە کێ کردوویەتی.

دەرەوە هیچـی لــێ سـەوز نابێـت.. بە پرتـاو خـۆم دەگەیەنـمەوە مـاڵەوە.. کە لەودیـوەوە دەرگـاکە لەسـەر خـۆم دادەخەم، شـیعرێکی (فەرزیـن)م بیـر دەکەوێـتەوە، کە هەمیشـە بەو شـێوەزارە شـیرینەی خـۆی دەڵێـت "کەنـی، بەگیانت دنیا شێویاگە.."

دڵــم قوڵــپ دەدات.. بە ژوورەکەدا ڕا دەکەم؛ ســـەعاتێک و دووان، کەنەفـــت و هێـز لـێ بـڕاو، لە خاڵێکـدا وەسـتاوم، لە خـاڵی جـووڵانمەوە نزیکتـرە تـا

* دێڕ شیعرێکی بەختیار علیە بەدەستکارییەوە.

خاڵی گەیشتنم. ئەم شێواوییەم چەند شێواوە خوا. نازانم ئەم ژوورە بۆ ئەوەندە درێژ بووەتەوە، چەند ساڵە من بەرێوەم و دەستم نادات لە دیوارەکەی ئەوبەر. ئەم ژورەی ئێمە هەموو جارێک وانییە.

خەم تیامدا فوارە دەکات.. دونیا تەمە.. ئەڵڵا بۆنی شێلم دێت.. زۆرتر خەیاڵ دەمباتەوە و وا دەزانم لە فیلمدام.. دڵۆپێک باران لە روومەتمەوە دەخلیسکێت.. حەزدەکەم بچم بۆ چۆمی (مەجیدخان).. شتێکم درز دەبات، تاسەی بانگ دەکەم؛ بانگ بە دەنگی کچێک. لەبەرخۆمەوە دەڵێم ئەگەر فەیروز بانگ بدات، چی دەبێت؟ هەموو لوبنان دەچێت بۆ نوێژ.. منیش دەچم، لەدوای دواوە نوێژ دادەبەستم.. هەرچەند دەکۆشم، هیچ ئایەتێکم ناکەوێتەوە بیر.. شیعرێکی هێمن لەبەرخۆمەوە دەخوێنم و لام وایە ئەو خودا گەورەیە هێندە بەرەحمە، ئەوەش وەردەگرێت. شەوێک بەدیار رادیۆوە خەو دەمباتەوە و لە دڵی خۆمدا بە بێژەرەکەی (ئێزگەی دیموکرات) دەڵێم: خانم تۆ هەر شیعر بخوێنەرەوە، من تا قیامەت گوێت لێ دەگرم.

من بە رێگادا زۆر دەڕۆم، جادە کوتێکم بۆ خۆی. هەر دەڕۆم، وام لێ هاتووە شەوان خەوەکانیشم پڕ لە رۆیشتنن. بە شێوەیەک، جاری واهەیە کە لە خەودام، وا دەزانم لە بێ داریدام و جاری واش هەیە بە پێچەوانەوە.. هەربۆیە زۆر گوێم لێ نییە چی روودەدات.. ئەو رۆژە وەختە بوو سکانیایەک بمکات بە تریت. نەترسام، وامزانی خەوە.. ئا من ئاوا سەرم لێ شێواوە.

دەم و زارم وشکە، چاوانم تەڕ، لێوم هەڵ پشکوتووە، ژنێکی شەهوەتباز بەتەوسەوە دەڵێت "ئەوە هیی بێ ماچییە." دەڵێم " رەنگە!" و لە چاوترووکانێکدا خۆمی لێ دوور دەخەمەوە.. زۆر بیر لەو برینانەی لالێوم دەکەمەوە، دایکم دەڵێت "هیچ نییە، منیش وابووم، چاک دەبێت، بەیانیان بینێ بە پەیژەی ئاسنا." من ئەو گەڕەکە تەیدەکەم و پەیژەیەک نییە، ئێستا هەمووی بووە بە قادرمەی غەربی.. پەیژەش قاتی بووە، بۆ

سەرکەوتن نا، بۆ ئەم تامێسکەی لێوی من. زمانم وشکە، خەریکە دەخنکێم، تینوومە. من لە ڕاپەڕینەکەوە تینوومە.
هەر کە من دەمەوێت سەرم چاک بکەم، سێ شەممەیە.
ئەوەندە کەرت بووم، ئیتر وا دەزانم بەسەر هیچدا دابەش نابم، بەسەر بچووکترین یەکە و بچوکترین ژمارەی نەدۆزراوەشدا.. "ئەم سەرگەردانیمە مەگەر خوا بزانێت چەند سەرگەردانە"[**] دەڵێم بۆن شێوەی هەیە؛ بۆنی هەنگوینی خەست، شێوەی قوچەکێکی دڕکاوی بۆ سەرەوە هەڵکشاوی هەیە.. بۆنی مندالی؛ شێوەی دڵۆپێک ئاوی هەیە لەسەر ئەلماسێکی شین لە دوکانی عەنتیکە فرۆشێکدا. گێژ بووم، بیبرەرەوە.
چەند چۆلە ئەم ڕۆحەی من، دەنگ دەداتەوە.. بەتاڵلاییەکی گەورە.. چالێکی تاریک.. ئەگەر ئەمجارە زیندوو بکرێمەوە، حەز دەکەم ژیانی عارفێک هەڵ ببژێرم لە ئێرانی دوور؛ لە مازندەران، یان باخەوانێک لە ئەندەلوسیا.. من لەناو خۆمدا گیرم خواردووە. ئەگەر بڕیار بوو بمرم نوکتەیەک لەسەر کێلەکەم بنووسن.. نوکتەیەک لەوانەی هەرگیز کۆن نابن.
وەک منداڵێک ورکم گرتووە.. پێ لە ئەرز دەکوتم، نە دەگەڕێمەوە بۆ لای خۆم و نە لێشی دەردەچم.. من لەم سێراتەی ڕۆحی خۆمدا، چەقیوم. ئەم کراکی[*] خەمە دەکێشم.. چش با هەڵ وەرێم، بەدیار چاوی خۆمەوە بڕزێم، خۆ من دەمێکە لە ناوەوە ڕزیوم.. لە کۆلانێکی پیسی پاریسدا، دوو جادە ئەولای ئێیڤڵەوە، تەزریق دەکەم.. لەگەڵ قولەیەک بووین بە ڕەفیق. هیچمان هاوبەش نییە، نائومێدییەکەمان نەبێت. پۆلیس دێت، ڕا دەکەین. دیسان من پۆلیس دوام کەوتووە.. پۆلیس بووە بە

[**] دێڕە شیعرێکی کەمال ئەمینییە.

[*] کراک: مەترسیدارترین مادەی هۆشبەرە کە سەرەنجام جەستەی قوربانییەکەی دەڕزێنێت، تەنانەت لەهەندێک مزگەوتی ئێراندا بە پاساوی ئەوەی هەڵدەوەرێت؛.پۆزشی ئەوە هێنراوەتەوە کە تەرمی موعتادی کراک ناشۆن!

دەعبـــایەک و هەمـــوو خەونـــی منـــی خـــواردووە، هـــاڕپویەتی.. چـــاو دەکەمەوە، دەمم وشکە.. من ئەو هەموو خەوە بۆ سەرەوبەرانە چییە دەیان بینم؟!

٢٠٠٨

# پڕۆپۆزەڵی ڕاکردن لە خۆم

ڕۆژانە نۆ سەعات لەسەر خۆم نیم، چوار سەعات دەخوێنمەوە و سەعاتێکیش لەگەڵ (هەرمێ) خۆم مەشغوڵ دەکەم، ئەوانی تری خەوتووم، دەمەوێت گەر بۆم بلوێت، ئەزموونی (ئەسحابول کەهف) دووبارە بکەمەوە.. خەریکی ماراسۆنێکم بە بەشداریی تەنیا خۆم و لە چەقی خۆمەوە بۆ دەرەوەی خۆم، هیوادارم یەکەم بم، دوعام بۆ بکەن. دەمەوێت ڕابکەم، نا لە شوێنی خۆمدا بچەقم، نە لە دواوە و نە لەپێشەوە نەڕوانم. دەمەوێت هەر سەیری هیچ بکەم.
ماوەیەکە بەقەد هەڵماتێک لە پشتمدا خڕبووە، وا هەست دەکەم خەریکم دەبم بە (قەمبورەکەی نۆتردام) یان نا، دڕودۆنگ و دەبەنگ وەک قەمبورەکەی ناو (پەیکەری فەرهاد). دەمەوێت خەتی تەلەفۆنەکەم دابخەم. مۆبایلەکەم بخەمە ئاودەستی مزگەوتێکەوە. ئیمەیلەکەم لۆک بکەم. کەس نەبینم، کەس نەمبینێت. دەمەوێت ئیتر شەراب و زەیتوون نەخۆم. دەمەوێت نەچمە ساڵی نوێوە، هەر لە ماڵەوە بەدیار داریوشەوە خۆم بخۆمەوە و ببم بە بابەعەمەرە.. شاخ و توک دەر بکەم، بەیانییەک وەک گریگۆری سامسا-ی کافکا بەڕووتی ڕابکەمە دەرەوە.
بە برادەرێکی شاعیر دەڵێم: "لەوانەیە ئیتر شیعر بنووسم.." پێشنیار دەکات کە هەموو شتێک بکەم و ئەو قۆڕییاتە نەکەم. دەڵێم: "ئاخر.." خەریکە بتەقم.. نازانم چی بکەم.. ڕەنگە نیوەڕۆیەک لەپڕ زرمە بکەم و سێ چوار نەفەری گێژ و وێژی دەوروبەری خۆم بەرم بە ئاسماندا.

به مەسیجێک دۆستایەتیم لەگەڵ قاچاخچییەکدا ئەپەدەێت دەکەمەوە و پرسیاری ڕێگەی لێ دەکەم، لەوسەرەوە بە چەند پیتێکی خوار و خێچ دەنووسێت: "ڕێگە عەیبی نییە، بەدڵی خۆمانە.." ڕەنگە نەتان بینمەوە، خواحافیز. ئەمە ئاخر ماچ و مووچە.. دەمەوێت تەرم و تارماییەکەشم بەم عەرزە حیزەدا ڕا نەبورێت.. بەری پێم دەخورێت.. وای چەند دڵم تەنگە. دەمەوێت ڕابکەم کە لەپڕ لە ناوەوەم ڕا گوێم لە پێ کەنینمە و لە دڵەوە قەشمەریم بە خۆم دێت. لە ڕێگەی شوقە بە (هێمن) دەڵێم: "ئەم سەدەیە سەدەی نائومێدییە، بیری ڕەفیق چالاک و ڕامیار مەحمود بەیەکەوە دەکەم.." نازانم هی ئەوەیە هەردووکیان بە (ڕ) دەست پێ دەکەن، یان هی ئەوەیە هەردووکیان نائومێدن. پێ هەڵ دەگرم. لەمسەرەوە بۆ ئەو سەر ڕادەکەم بەناو ئەم تاریکاییەی خۆمدا. دەیهێنمەوە یادی خۆم، جیاوازیی ئێستا و جارانم لەوەدایە؛ جاران بە سابوونی لۆکس خۆم دەشۆرد، بە گوێزانی سەفەری ریشم دەتاشی.. ئێستا ریشم ناتاشم، بەیانیان دەموچاوم ناشۆم. قتووی جێڵەکەم فڕێدەدەم و ئیتر کراسەکەم ئوتوو ناکەم. بە چاکەتە زیرەبییەکەمەوە وەک هەمیشە سەعات حەوت لەماڵ و لەخۆم دێمە دەرەوە. ماوەیەکە سەیارەکەشم وەک خۆم وڕە. دەچمە دائیرە، با کچەکان هەر پێ بکەنن. لە دواوە چەمۆڵەم لێ بنێن.. کە تێ پەڕیم، تەعلیق بهاوێن.. گوێی خۆم کەڕدەکەم، وادەزانم هیچم نەبیستووە.

ئەفسانەی کاوەی ئاسنگەر بە فارسیی دەخوێنمەوە. گاڵتەم بە دەوڵەتی (مەد) دێت.. وا دەزانم جەنگەکانی یەکەم و دووەمی جیهانی، ئەفلام کارتۆن بوون.. وا دەزانم کەس نەمردووە. (دریسدن) درۆ بووە.. هەموو ئەوانە فتبۆڵێن بوون، یارییەک بوون و تەواو بوون.. کێ سەیری یارییەکی تەواو بوو دەکات؟! حەز دەکەم کوێر بوومایە، هەر هیچ نا؛ هێواشتر دەڕۆیشتم لە ڕێگا.. بە دایکم دەڵێم: "ئەوە دایە بۆ ئینسان کە کوێر دەبێت، دەنگی خۆش دەبێت؟"

لەگەڵ بەنگلادیشییەکدا دەبمە ڕەفیق. جگەرەکەی خۆمی دەدەمێ و گسکەکەی لێ وەردەگرم.. دەمەوێت پەڵەیەک لەسەر دڵم پاک بکەمەوە. ئەو پێ دەکەنێت و لەبەرخۆیەوە شقڵی و پقڵی قسانێک دەکات. وا هەست دەکەم ئەو کورە ڕەشتاڵەیە وتبێتی "حەیفێ تۆ مەهارەتی فێربوونی گسکدانیشت نییە".. شەوان قەڵەم و وەرەقەیەک دەبەمە ژێر بەتانییەکەم و هەر بە چاوی نوقاوەوە، خەوەکانم دەنووسمەوە. سەدای دایکم لە گوێمدا زایەڵە دەکات کە دەڵێت "ئەرێ ڕۆڵە تۆ بۆ وا لە خۆت دەکەیت؟!"

دیالۆگێکی (سوکرات)و (گلاوکۆن) لەمەڕ عەدالەت دەخوێنمەوە، کە ژنەکەم بە پرسیارێک ڕام دەپەڕێنێت: "ئەرێ ئەمە ئەفلاتوونی حەکیم نییە؟".. "بـا" باوێشکێک دەدەم و دەڵێم "بەس ئەم تەرجومەیە لە حیکمەتی خستووە." لەبەرخۆمەوە نایەڵم ئەو گوێی لێبێت، دەڵێم: "وەڵڵاهی پیاو موشێن بکات، بەختەوەر ترە لەوەی فەلسەفە بخوێنێتەوە.." ماوەیەکی زۆرە قسەم لەگەڵ خۆمدا دابڕیوە.. دەزانم ئیتر لەوە زیاتر بەرگە ناگرم، کەچی ئەوەندە کەللە ڕەقم، نامەوێت لەگەڵی ئاشت ببمەوە. دەمەوێت ئیتر غاز پڕ نەکەمەوە و بایەعییەکە وەرنەگرم. شەوێک وەرەقەی نەوتەکە دەدەم بە کرێکارێکی شەنگاریی بەردەرکی سەرا.. لە فەیەک لە قوڕ دەخۆم، شیشێک زەهری مار. بە شەقامەکاندا ڕادەکەم، جوێن دەدەم. لەناکاو دەوەستم و دوای قەیرێک بێ دەنگی، لەبەر خۆمەوە پێ دەکەنم.

توتە و براتوتە نەبن، هەموو پەنجەکانی دەستی ڕاستم دەزریکێنن.. هی ئەوەیە فشارم زۆر لەسەر داناون، چی بکەم پاندانەکە نانووسێت.. تا دەستم دەگات فرێی دەدەم.. نازانم ئەرێ دەم ویست چی تر بکەم؟!

سلێمانی ٢٠٠٨

# من بێتاقەتم؛ کەواتە من هەم!

*"من بۆخۆشیی نانووسم، نا .. من دەنووسم تا لەشەڕی ئەفکاری خۆم ڕزگارم ببێت.. ئەمەش شتێک نییە بەویستی خۆم، بەڵکو شتێکە ناچارم....."*

**فریدریک نیچە، ویستی هێز**

چەند ڕۆژێکە باشم ..

ئەمە حاڵمی خراپ کردووە! ڕیتمی تێکداوم. دەزانی من ڕانەهاتوو باشبم! خۆشت دەزانی کە بۆت دەنووسم (باشم) درۆ دەکەم.. حەقیش نییە ئیتر من دەسکاری وەڵامەکەم بکەم، حەق وایە تۆ پرسیارەکەت بگۆڕی.. بمتوانیایە کارەکەتم ئاسان تر دەکرد، بەڵام خەنجەرێک لەم سنگە لاغرەم هەڵ بچەقێنە و ئەم خیانەتەم لەخۆم پێمەکە.. ئەمە مێژووی منە؛ من باش نیم.

حەزدەکەم وەک تاکێ گۆرەوی دڕاو لە دڵمت داماڵم و تا دەستم دەگات فرێت بدەم، بەقەولی دۆستە کرماشانییەکەم زۆر دەترسم دیداری من و تۆ بکەفێتە قیامەت.. دەزانی من و تۆ وەکو یەک و هەشتین! هیچ یەک و هەشتێکی ترنا، تەنیا ئەوەی وا لەناو لەپی چەپتدا.. پلانم هەیە؛

دەست لەخۆم هەڵبگرم و واز لە تۆ بهێنم، ئەمە بۆ هەردووکمان باشترە.. کە ئەمە دەڵێم ئەشزانم غوربەت یانی ئەو شوێنەی تۆی لێ نیت...!

بیری شارەکەم دەکەم و لەخۆشمەوە لام وایە ئەو شارەی من هەر ئەرزشی ئەوەی هەیە لە دوورەوە بیری بکەیت و هیچی تر.. پڕم لە خەیاڵی ئەم شارە وەک تاسەی قەسابخانە لە سەری سەگدا. چاو دادەخەم، هەستم ڕا دەگرم، حەز دەکەم دونیا لە کونێکی ترەوە بێتە ناو منەوە.. حەز دەکەم ڕابردووم لە جێیەک دانێم، بەڵکە لێم جێبمێنێ وەک جێمانی چەترێکی ڕەش لە پاسێکی سپیدا.. دوای ٤٦ سەعات کە بۆ یەکەمجار لە ژوورەکەم دێمە دەرەوە ئەوجا دەزانم کەمن وەستای کوشتنی کاتم! بەجۆرێ دەتوانم شەش سەعات چاو لەسەر تۆیکڵە گوڵەبەڕۆژەیەکی خوراو قەتیسبکەم و وەڕسیش نەبم.. ئەگەر لێرە مامەوە کۆرسێک لەمەڕ باوێشک وەردەگرم.. من ڕشانەوەیەکی گەورە بەخۆم قەرزدارم.. ڕشانەوەیەک هەموو ئەو ئازارانە بێنێتەوە کە لەم ڕۆژگارانەی دوایی ژیانمدا چەشتمن..

بۆنی هێلکەوڕۆن دێت و بیری ژنەکەم دەکەم.

دەزانم ئەوسەرە ئەبستراکتەی تۆ هێزی تێگەیشتنی ئەو ڕستەیەی نییە، ئەوەتا لچت هەڵ دەقورچێنی و شانەکانت بەرز دەکەیتەوە:

- جا چییە؟!

دەمزانی تێ ناگەیت.. دەشزانم هەرچی شتی نێو ئەم دونیایە هەیە ئەگەر نیگای موجەرەدت بکەوێتە سەری، ئەوەندە بێ حورمەت دەبێتەوە تا ئاستی پرسیارەکەی تۆ...

حەبیبم..

گرنگییەکە لەوەدایە لەناو حەوت ملیار مرۆڤی سەر ئەم هەسارە هێلکەییەدا، تەنها من دەتوانم بۆنی هێلکەوڕۆن و بیری ژنەکەم بەیەکەوە بکەم و بەقووڵییش بیر لەو پەیوەندییە خەیاڵێکتییەیان بکەمەوە.

حەقـی ئەوەت هەیە بـتخەمە ژێـر ڕەگـی سـێجای خـۆمو پـێم بڵـێ دەتـوانی چەند بەرگە بگری..؟

قەشـــمەرییەکی قورســـم بە خۆشەویســـتی دێ، لەوە نـــاچێ مـــن جـــارێکیتر عاشـق بـبمەوە (بەس تـۆ ئەم قسـەیەم بە سـەنەد لـێ وەرمەگـرە!).. دڵـم لێـی داوە عـومرم وەفـا ناکـاو پـێش ئێـوە دەڕۆم، ئەگەر ڕۆژێـک لەپـڕ دیـار نەمـــام بەو دۆســـتی دوورە وڵاتە بڵـــێن ئەم مانفێســـتی نائومێـــدییە تەواو بکات.

مەقـــامی ڕاســـتەقینەی ئومێـــد لە بـــێ ئومێـــدی گەورەدایە، لەوانەیە لەم ڕۆژانەدا شـــتێک لەبـــارەی مەعـــریفەی مـــامەڵەکردن لەتەک نائومێدیـــدا بنووســـم.. حەزدەکەم قـــاچم تـــا ئەژنـــۆم ئەوەنـــدە گەورەببـــێ، ئەوەنـــدە گەورەببـــێ، ئەوەنـــدە گەورەببـــێ تـــا بتـــوانم یەک شـــەقی قـــایم لەم گـــۆی زەویـیە هەڵـدەم و فڕێـی بـدەم بـۆ شـوێنێکی دوور، ئـاخر مـن لە شـوێنێکی تریشـدا پـێم وتـووی کێشـە شـوێنەکانە، دەبـێ شـوێنەکان شـوێنگۆڕکێ پـێ بکەین، بەس تۆ ئەوەندە بۆشی ئەم قسەیە ناچێت بە هیچ شوێنێکتا.

تـــۆ بچـــۆرەوە شـــەوانی هـــاوینی هەشـــتاکانی بەرTV یەکـــی ڕەشو ســـپی و بەدیـــار هەڵقەیەکـــی ســـورییەوە تێربگـــری و منـــیش لێـــرە لە ناوەڕاســـتی ئەم بەفـــری خەمە ســـەنگینەدا دەوەســـتم تـــا دوا کلـــوی ئەم مەراقە پڕوشـــە دەکـــات، ئینجـــا ســـەرێ بـــۆ ئاســـمان بەرزدەکەمەوەو وەک ئەوەی وێردێـــک بخوێنم دەڵێم (سوعبەتی بێ تام لەگەڵ ئینسان دەکەیت.. دەزانی؟!)

قومێـک لە چـــا ڕوونەکەی بەردەمـــم دەخـــۆمەوە، دەســـتم لەســـەر ڕیمـــۆت کـــۆنترۆڵی TVیەکە جـــێ بەخـــۆی نـــاگرێ، وەک هەمیشـــە گـــۆرانییەکی ناســـازە.. میـــوتی دەکەم و زۆر بە تونـــدی لە وشـــەی (ڕوخـــان) ڕادەمێـــنم.. نە وێـران و نە شـکان و نە کـاول و نە ڕمـان هیچیـان تـامی خـۆی نـادەن.. ڕوخـــان.. ڕوخـــان.. ئەم پێـــنج پیـــتە مۆســـیقایەکی تـــایبەتی خۆیـــان هەیە.. مـن کە ئێسـتا دەڵـێم ڕوخـان، هەسـت بەداکەوتـن دەکەم.. دەکـۆکم.. قـوڕگم پڕبووە لە تۆز.. چاوم هیچ نابینێت...

شـتێکت پـێ دەڵـێم بەس لای کەس باسـی مەکە؛ وابـزانم ئەوە خـۆم بـووم ڕوخام..!

ئەم مـاوەیە کەوتـومەتە درزێـکەوە، سـەد بریـا درزکەی تـۆ بـوایە.. نـا درزێکـی تـرە، درزی نێـوان ناڵنیـای و یەقـین، خەریکـم دەشـێوێم، ئنجیـل و دیکـارت بەیەکەوە دەخـوێنمەوە، کەچـی بەنیـازنیم شـکۆی ئەم شـکەم بەتـاجی شـاهانەی یەقینێکـی حـۆل بگـۆڕمەوە. دەبـێ شـتێک بـکەم.. هـاوارێ.. قیـژەیەک.. پەلەقـاژەیەک.. تـا بەڵـکە لەم درزە فریـادم بـێ.. ژیان لە درزدا زۆر سەختە.. زۆر.

کەسـێک هەیە کە سـەرمای دەبێـت منـی بیـر دەکەویـتەوە.. هەرباشـە ئەمە یـانی مـن هێشـتا مـاوم، لـێ هەوای ئێـرە زۆر تەنـگە، هەناسـەم سـواربووە و خـۆم نیـازی دابەزیـنم هەیە.. خـوێن لەسـەرما وەقـفەی کـردووە و هەوا بەسـنگمدا عبـوور ناکـات.. هێـدی هێـدی بەرچـاوم ڕەش دەبـێ و خەریکـم دەسـتی شـل و لەرزۆکـم بەرزبـکەمەوە و وەک علـی شـەریعەتی بە هەمـوو قوڕگم بقیژێنم: ژیان بووەستە.. دا دەبەزم!

٢٠٠٩

سـۆفـیـا

# Exit

مێخ بە زماندا دا دەکوتم و قڵیش دەکەمە زارمەوە..

بـــا بە پەردەکەدا دێـت، کەمەری نیشـــتووی پـــڕ دەبـــێ لە هەوا، دەڵێــی ژنێکـی سـکپڕە و لە پەنـجەرەی شـکاوی مـنەوە سـەیری دنیـا دەکـا.. دەڵێـی دەمەوێ شـــتێک بشـــارمەوە.. کەمکەم قســـە دەکەم و زۆرزۆر خەیـــاڵم دەڕوا.. بەشـــێوەیەکی گشـــتی مەنگـــم.. دەمەوێ کەس نەزانـــێ کە بیـــر لە تـــــۆ دەکەمەوە.. هەمـــــوو هەوڵـــێکم دەخەمە گەڕ ئەمە لە هەمـــــووان بشـارمەوە.. چەشـنی بـازێکی سـپی لە سـنگی ڕەشـمدا شـتێک قەتیسـە.. سـنگم شـەق دەبـا و ئەو شـتە دەقیژێنـێ و دوور دوور دەچێـتە ئاسـمان. کە هـاتم ئـا لێـرەدا بـووم.. لەسـەر ئەم قـادرمەیە.. ڕێـک لە ناوەڕاسـتدا، نـازانم دەمویسـت دابەزم یـان خەریـک بـوو سـەر دەکەوتـم.. دە سـەدەیە مـن لێـرەدا گیرم نازانم دابەزم یان.......

نـۆڤێمبەری مـن ون بـووە، لەوە دەچـێ نـۆڤێمبەری مـن لە جـوولا-یـا بـێ، چەنـد خۆشـە ئیتـر لە دایـک نـابم، ئیتـر هەر بە فەزاوە دەبـم.. بلیتـی نـۆڤێمبەرم لە دەسـتدایە و بە تەنیـا لەسـەر چرپـایەکی دوو نەفەریـی ڕاکشـاوم.. ڕەنـگە نـۆڤێمبەری مـن زۆر دوابکەوێـت، ڕەنـگە دە سـەدە.. ڕەنگیشـە هەر نەیەت.. مـن کـاتێکی زۆرم هەیە.. دەتـوانم دە سـەدە چـاوەڕێ بـکەم، چـاوەڕوانی شـتێکی نـاخۆش نیـیە "چاوەڕوانی کـلاوڕۆژنەی ئومێدێکە لە نـائومێدییەکی ڕەهادا"*..

---

* دێڕێکی عەباس مەعروفییە، لە ڕۆمانی پەیکەری فەرهاددا.

مــن لەم دونیــایەدا ئیشــی زۆرم نیــیە، لە کۆتاییــدا خۆشــە بزانــی تـــــۆ بەهــانە بــووی بــۆ ئەوەی بمێــنمەوە.. لەوەش خۆشــتر؛ تـــــۆ بەهانەیــت بــۆ ئەوەی بـڕۆم.. ســەر هەڵبــڕە و ســەیر بــکە؛ چەنــد جــوان و چەنــد درەنــگە، پاوانە لەقاچی چەپی مانگ دایە و لای من سەعات هەزارە...

وەک ژنێکــی ســکپڕ هەمــوو ڕۆژێــک ملیمێــک لە ســەری مــن زیــاد دەکــات، لە کۆتاییــدا مــن ئەم مەراقەم دەبــێ.. بەســەردا دەکەوەمە ئاســمانەوە، دەســتم تەڕ دەبــێ و هەور وەک تــۆپەڵێ پەشــمەک دەچــێ لە قــژمەوە.. کە ســەیری ئەم کاکێشــانە دەکەم چــاوم پــڕ دەبێــتەوە.. کێشــەی مــن ئەوە نیــیە چەنــد هەســـــــارە لەم گالاکســـــــییەدا حۆلەحـــــــۆلە و بـــــــازنەیی بەدەوری یەکـــــــدا دەخــولێنەوە، کێشــەی مــن ئەوەیە بۆشــایی کەســم پــێ پــڕ نــاکرێتەوە، کە هەســت بــکەم؛ مــن بــۆ خــۆم بۆشــاییەکی درێـــــــــــــژم.. چەنــد ناخۆشــە ئەوەنــدە بەتــاڵ و ئەوەنــدە بــێ بــاک بیــت..! بیــر لەوە بــکەرەوە؛ ڕۆژێکــی ڕەشــەبا بچــین بــۆ گۆڕســتان، پــێکەوە بچــین، لە (بـــــــا)دا بونیــام دەتــوانێ گــوێی لە دەنگــی مردووەکــان بێــت.. لە گۆڕســتان گــۆرانی دەڵــێم.. لە گۆڕستان دڵم پڕ دەبێ..

لە گۆڕستان..

هیچ.. لێی گەڕێ.

زمــان زیــن دەکەم.. ســوار ئەســپی خەیــاڵ دەبــم و دەڵــێم غــاردە بــۆ کــێڵگەی پــڕ لە مینــی میتــافۆری مــن.. مــردن؛ گیرخــواردنە، مــردن یــانی زینــدانی عــومری ئەبەدیــی، ئەو هەمــوو ئــازیزە ڕۆیشــتن و ســەرێکیان نەدایەوە.. شتێکیان نەگوت، چۆن تاقەتیان هەیە ئەوەندە بمرن..؟

دڵـــــم قەتــرە قەتــران ســـەر دەخـــات.. مــن دەڕۆمە دەرێ.. لە کــوچەی شــارێکدا گیــرم، نــازانم شــامە یــان ئیســتامبوڵ.. زەوی لەژێــر پێمــدا عــارەقی کــردۆتەوە.. بە پشــتەملیدا ڕێچــکەی بەســتووە.. زەوی لەبــن بــاری قورســـی خۆیــدا هەزار ســـوێند دەخـــوات؛ ٦٣ ملیێــۆن ســـاڵە ئەوەنـــدەی ئێســـتا، (ئینســـانی هەزەلیـــی) هەڵنەگرتـــووە.. زەوی زۆڵـــێکە کە دایکـــی

خـۆی ون کـردووە، زەوی بە منـداڵیی فێـری جـادوو دەبـێ و ئێسـتا خەریـکە تەلیسـم لە مـن دەکـات.. مـن نـاتوانم بـاوەڕ بە سـەوزیی زەوی بـکەم، ئەو خۆی لە ناوەوە دەکولێ.. من سەفەرێکم لەبەرە بۆ خاکی ڕەش..

مــــن دەبـــــێ بـــــــــــــــــڕۆم..

جیهـــان ســـەری دێشـــێت و مـــن پەڕۆکەیـــم بە نـــاوچەوانمەوە بەســـتووە. گونـاهن.. بەریـان دەدەم ئەوهەمـوو قسـەیەی لە سـەرم دان... سـەرم تونـد دەگوشـم و لەبەر خـۆرەکە هەڵـی دەخەم.. ئـێ نـاکرێ ئەوەنـدەش لە مـردن بترسـین، خـواکە! ئەو هەمـوو دۆسـتەی لایە.. دەزانـم لەم نادڵنیـاییەم دڵنیـــام.. ژێـــرەوژوور بـــووم، زەوی ڕاگـــرن ســـەرم دەخـــولێتەوە.. غەڵبەغەڵبێکـی هێواشـــە.. خـۆمی لـــێ ونـــم.. کە مـــن لەگـــۆڕێ دەبـــم ژاوەژاوەکـان شـتێکی تـرن.. لە چـاوەڕوانیی نێـوان مـاوەی دوو قسـەدا مـن بیـر لەجیهـان دەکەمەوە، هەمـوو شـتێک تەواو بـووە، ئەم دونیـایە چـی لـێ بکەیـن، ئـێمە هێلکەیەکـی بەجێمـاوین، ئینسـان زۆر تەنیـایە زۆر.. وا نیـیە؟ ئەی ئەگەر خـاوەنی هـێلکەکە هـاتەوە...؟ مـن سـەفەرم لەبەرە.. سـەفەری گەیشتنەوە بە یەکەم خاوەن و بە یەکەم دایکی ڕاستەقینەی خۆم..

بەقەد یەک شـــێـــــــــــر خـــــــــــەوم دێ..

مـن خـۆم نـاژیم.. مـن ژیـانی کەسـێکی تـرم هەڵگرتـۆتەوە.. لە لاجـانگمەوە بەیانیـان دووکەڵێکـی سـپیی کـز بەرز دەبێـتەوە، ئـاخر مـن شـەوی یەک لـــــۆری خەو دەبیـنم.. خـودام بـۆ نـاخرێتە لابـۆرەوە.. دەمەوێ بنوسـم لە میتافیزیکـدا بـا عەقـڵ بچـێ بـۆ جەهەنـنەم.. مێـرووڵەی سـووری گەورە لە چـاومەوە دێـنە دەرێ، گلێـنەم لە ڕەشـێکی کـاڵەوە دەبـێ بە سـوورێکی خوێنـاوی.. مـن تەنیـا دەتـوانم ئـازار بگێـڕمەوە.. تەنیـا دەتـوانم هـاوار بـکەم؛ چاوم تەقـــیـــــــی ی ی ی.

بە بـاجەکەی ملیـدا دەزانـم ڕۆژنامەنووسـە، ڕیکـۆردەرێکی لە ئاسـت چەنەم حەواداوە، کچێکـی بـاریکەڵەی ئەسـمەرە، شـتێک دەڵـێ.. هـیچ تێنـاگەم، سـەرم ڕادەوەشـێنم کە قسـەکەی دووبـارە دەکـاتەوە، بە لیپسـنی کورتیـدا

دەزانم هەمان شتی پێشوو دەڵێتەوە.. لە ژاوەژاوی دەنگیدا وا دەزانم چاوەڕێیە کە من پێی بڵێم "ژن چییە؟!" ئەم پرسیارانە سەرم بزماڕڕێژ دەکەن.. ئەمە قورسایی ستەیمێنتێکە لەسەر دڵی من.. لەناو خۆمدا هەڵدەچم.. ڕقم کەف دەکات.. خەریکە جوێنێ بدەم کە چاوم لەسەر سنگی دەگیرسێتەوە.. بەزەردەخەنەیەکی درۆزنەوە دەڵێم "وا بزانم سەر بە کۆمەڵەی شیردەرەکانە". شەو تەنهایە، من بەدیارییەوەم.. شەو مەستی کردووە و لە میترۆپۆلێکی پیردا دەگریی، سەری خۆی بە موحاجەرەکاندا دەکێشێت، خۆی دەگەوزێنێ، من دەڵێم "هەستە کاکی من.. ئا ئێستا ڕۆژ دەبێتەوە و حەیامان دەچێ".

ئەزانم سۆفیا شارێکە لە من کەچی لەسەر لمی داخ و ئالتوونی قەراخ دەریاکە لە بوداپێشتم.. دەبێ گەورەبیی.. ئەوەندە گەورەبیی.. ئەوەندە گەورەبیی.. ئەوەندە گەورەبیی بتەقێت.. من خەریکە دەتەقم، ئەم زەوییە خوێڕییە ناجولێ..!! وەهمێکی گەورەیە لات وابێ پێش زەمەنی خۆت کەوتوویت، لەوە بەدبەختیی تر ئەوەیە دوا کەوتبێتی، من نازانم کامیانم، بەڵام ئەزانم ناتوانم لە شانی خەڵکەوە بڕۆم.. هێڵنج ئەدەم، نامەوێ گەرووم بە زەرداوی خەڵک پیس بکەم، خەریکە دەڕشێمەوە؛ خودایە؛ کۆتایی بەیارییەکە بێنە.. ئەگەر تاقەتت هەیە، ئیتر ڕایگرە..!

لێی نەویوم.. دەمەوێ پەنجە تووتەی خۆم هەڵکەنم.. هێزی لێ دەکەم کرتەیەک لە دەستم هەڵدەسێ.. بەردەوام دەبم.. جومگەی بەشی چەپی دەستم دەزریکێنێ.. خوێن زاوەتە دڵم و ئازارم گەیشتۆتە عەرش.. ئەرێ چی بکەم؟! ئا ئەمە پرسیارەکەیە.. ئینسان دەتوانێ چی بکات..؟ بۆ یەک چرکە هەست دەکەم گێژم.

دڵم تێک دەچێ.. دەڕشێمەوە و کتێبێ قەبە لە زارمەوە دێتە دەرێ.. پرۆست دێنمەوە.. تۆماس مان.. بیکێت بەسەری سپییەوە لەقوڕگمدا گیرە لەملا و ئەولای زارمەوە قەترە قەترە عەبەس دەتکێ.. ئەم

قورگئێشەیە بڕستی لێ بڕیوم.. دایکم گوڵەهێرۆم بۆ لێدەنێ، من بیری (هێرۆ) دەکەم و دەڵێم وەڵاهی باش بوو بۆیەک نەبووین، ئێستە ناوسکم خوارد بوو.. ئێستە دەمێ بوو سەری کون کردبووم..!
وەک دوورکەوتنەوە و لەچاو دیارنەمانی ماشێنێکی کۆن لە ڕێگایەکی خۆڵدا.. ئاوا من ئاوا دەبم.. بەیانییەک لە خەو هەڵدەستم، دەست دەدەمە ژانتاکەم و ئەڕۆم بۆ (مۆرۆکۆ) دایکم پێ دەکەنێ.. دایکم بە پێکەنینەکەی سەفەری من بۆ (مەغریب) هەڵ دەوەشێنێتەوە.. هەموو جارێ دایکم بە پێکەنینێک؛ پێکەنینێکی سارد، فیزایەکی من پووچەڵ دەکاتەوە و سەفەرێکم پەک دەخات و ڕێگایەکم پێ دەگۆڕێ.. ژانتاکەم فڕێ دەدەمە دەریاوە و دڵم لەسەر مێزی تەلەڤیزیۆنەکە دادەنێم بۆ تۆ.. "هاوکینگ" دەخوێنمەوە و حەز دەکەم بڕۆم بۆ شارستانیەتێکی تر.. سەری دۆستایەتی لەگەڵ شتێکی تر دامەزرێنم کە وەک شووشە دڵی ببینم لێ ئەداو پڕ نییە لە کەسی تر.. ژانتاکە هەڵدەگرم و دڵم ئەخەمەوە شوێنی خۆی و دەمەوێ بڕۆم.. کە دایکم لە کۆڵان پێ دەکەنێ و ئەڵێ "کوڕم؛ ئینسان کە ڕێبوار بوو، شارەکان هەموویان وەک یەک وان".
ئەمساڵ وەنەوز دەدا.. ئەمساڵ لەسەر باسکی چەپم باوێشک دەدا.. بە گیانی من گیان دەدا و نامرێ..! ئەوە ئەمساڵ بۆ ئەوەندە درێژ بوو..؟!
من لەم قاڵبەی خۆما جێم نابێتەوە.. دوو دەست و دوو قاچ و یەک سەر، کەمە بۆ من..! من ئەم هەموو عەزابە دەژیم.. یەک بەیانی هەڵدەستم و ئیتر من خۆم نیم، خۆم بووم بە تۆ.. ئەو هەموو برینە لادێییە چییە لە مندا..؟
دیسان باش نیم..
ئەم کۆکە خوێناوییە بڕستی لێ بڕیوم.. چەند جارێک سنگم لوول دەخوا و دەیەوێ لە زارمەوە بێتە دەرێ، ناهێڵم.. بیرت دێ لەو ساڵانەدا پێم گوتی "من باش نیم و ئەمەش مێژووی منە..!"؟ سەرم دەکەم بە

جـادەیەک هەر تـۆی پێـوەی.. بـاوکم نـیگەران تەماشـاـم دەکـات و دەڵـێ "دڵـی شـکاوە.!" دایکـم خـۆی دەکـات بەرِسـتەکەی باوکمـدا و پەلەپەل دەڵـێ "لێـی گەرِێ، شوشـە نـابژێردرێ.." دڵێـک کە بە مـنەوەیە سـەری لـێ شـێواوە، لە جیـاتی بڵـێ تەپ.. تــەپ، دەڵـێ تـۆ.. تــۆ. لەنـاو خۆمـدا گیـرم خـواردووە، دەمەوێ چیرۆکێـک بنووسـم لەسـەر خەونـی سـیفۆنێک لە تـوالێتێکی کچانـدا؛ سـیفۆنێک بیـر لە کـورِ بکـاتەوە.. بیـر لە فـۆرمێکی تـر بەسـەر خـۆیەوە.. تەواو دەبـێ بـرِۆم لە پـلەی گەرمیـی ٣٠٠ هەزار سـانتیگرادی کرۆکـی زەویـدا دەسـتی خـۆم داخ بـکەم... دەچـمە بنـی دنیـا لە (ماریانـاز تـرانش)** وا بـزانم لەوێـش بیـر لە تـۆ دەکەمەوە.. خۆشـم دەوێـی.. جـارێکی تـریش خۆشـم دەوێـی.. جـارێکی تـریش خۆشم دەوێـی.. جارێکی تریش....بەسە، سەرم ئێشێت..

حەز دەکەم تـۆ بقیژێنیـت و مـن هـاوار بـکەم.. ئینسـان یـانی یەک زریـکەی دریـژ... لە (١) رِا دەمێـنم.. (١) رِەنگـێکە زمـان پەیـی پـێ نەبـردووە.. تـا ئەو (١) رِیـنەیم دەکـات، مـن (١)م.. ژمارەکـان سـەریان لە بونیـام شـێواندووە، مـن (پیـت) مـامەڵە دەکەم.. ژمارەکـان لە دونیـادا لە دایـک دەبـن، پیتەکـان خۆیـان هەن.. ئـاخر ئەوان دەسـت پـێ نـاکەن تـا کۆتاییـان بـێ.. چـاو دابـخە؛ نـوکتە دەبـارێ.. نـوکتەی ژێـر خۆشـترە.. دەزانـی! ئەوانـیش نێرومـێ ن؛ (ل) چ بەژنرِێـک چ باریـک و چ کچـانەیە..! جیهـانی مـن بـێ ژمـارەیە.. (ئەلـف بـێ) لەگەڵ خـۆم دەبەم بـۆ بـازارِ؛ پـرِ کتێـبەکە برنجـی بۆنـدار دەکـرِم و بـایی (ت) کیلـۆ میهـر.. کە وشکەفرۆشـەکە لەسـەر تەرازویەکـی کـۆن قەنـد دەکێشـێ.. دەڵـێم (بزوێنـی کـورت) کیلۆمـان بەسە.. ئێمە دوو کەسین، یەکێکمان هەر خۆی شەکری کەللەیە..

ئەرێ زەوی قورسـە، یـان سەری مـن..؟

** ماریاناز ترانش: دواخاڵی پلەی قوڵاییە لە جیهانی ئاوییدا، لە ناوەرِاستی زەریای ئارام.

ڕوناکییەک لە منـدایە؛ خاپوورکـار.. دەبـێ سـپینۆزا بخـوێنیتەوە، بـۆ ئەوەی تێـبگەی کە نـوری مـن دەتـوانێ ئەسـتیرە لە خـولگە لادا.. چـاوم دا دەخەم.. دۆخەکە خراپتـرە، بە درێژایـی کـۆڵانەکەدا بە تەنیـا دەڕۆم، دووسـەد جـار هەڵـدەنوتێم و سـەدجار دەکەوم.. سـەرئەژنۆم خـوێنی زامێکـی لـێ دێ کە لە دڵمـدایە، دەزوولەی شـیتاڵ شـیتاڵی خـوێن پیشـانی دونیـا دەدەم.. مـن بـرین دەجـنم و خـوێنێکی سـووری کـاڵ لە گـوێچکەمەوە فـیچقە دەکـات، لە کۆتـایی کـۆڵانەکەدا ماڵێـک پـێش ئـاخیر خـۆم دەکەم بە ژووردا، بە خێرایـی بیـرم دەکەوێـتەوە کە هەمیشـە سـەری نابینـا لە دوو ئاسـت زیـاتری نیـیە، یـان زۆر نـزمە یـان زۆر بەرز، قسـەیەکی فەرەیـدونێ م بیـر دەکەوێـتەوە کە دەیگـوت "نابیناکـان دوو ڕەهەنـدن، بیناکـان ٣D"..
کەچی من یەک ڕەهەندیم، ئاوا ژیان ئاسان و بێ سەریەشەترە..
مـێخ لە زمـان دەکێشـەوە و زاری زامـدارم دادەخەم.. دەمەوێ دەموچـاوم بشـارمەوە دەمەوێ سـەیری دنیـا نەکەم، وەک وشـترملێک سـەرم لە جیهـان پەنهـان دەکەم.. سـەرم لەژێـر کڵاوەکەمـدا حەشـار دەدەم.. دنیـا دەپشـکنم بـۆ ڕێگـایەکی شـەریفانە.. مـن ئەمەوێ لە جـیـهـان بـێـمە دەرێ..

٢٠١١

# دالانی دۆزەخ

بــۆ ئەوەی دەرەقەتــی بێیــت، دەبــێ لە ژیــان بــێ حــورمەت تــر بیــت..
کتێبەکــان.. کتێــبە کۆنەکــان هەڵەیــان فەرمــوو، تــۆ ســەرداری دونیــا نیــت..
دڵــم لە ســنگی چــۆلەکەیەکی دەنــوک زەردی ترســاودا لــێ ئەدا، بــا ســەگێک
دە جــار لە مــن پتــر، پیــاوەتی بفــامێ.. خۆشــیی بکــوژێ پشــیلە ئیــرادەی
ناگــاتە تــۆ.. گەردوون لە منــدا ئێشــێت...    تــۆ شــتێکیت لە نێــوان ئەوانــدا..
ســێ جــار لەســەریەک تــف لەوەی شــانازی بە مرۆڤــایەتییەوە دەکــات،   ئەم
غەمگینیــیە جــارێ بەدەوری زەویــدا دەســوڕێتەوە و شــەش جــار بەدەوری
تــۆدا.. هەتــاوم ســەعاتێکی تــر بــڕ ناکــات و وەک باڵنــدەی   شــەو بەتەنیــا
دەفــڕم.. دەبــێ بــڕۆیتەوە بــۆ ژیــانێکی تــر، بــۆ ئەورووپــای مەرحــووم.. تــۆ
ڕۆحــی خــۆت دەکرۆژیــت و بیــر لە شــەیتان دەکەیــتەوە، کە لەگەڵ خــودا-دا
ســنوری خۆیــان دەزانــن و کەســیان نــاچنە حەرەمــی یەکتــرەوە.. بەو
بچــووکییەوە چ فەخــرێکە ئەو هەمــوو عاســیی بــوونە، خۆشــە شــەڕێک
بکەیــت، کە ســوور بزانــی دەدۆڕێــی.. مــن ئەو سازشــە دەبەمەوە، کە
نایکەم.

شــەیتانێکی ئــاوا جــوان، ئیبلیســێکی ئــاوا حیــز، هــی ئەوەیە خۆشــت بــوێ..
ئەم ڕۆژانە بەدەســت خــوداوە گیــرت خــواردووە.. خــودا برســتی لــێ بڕیــووم..
مەولانــا ڕاســتی فەرمــووە (چــون در نهــانیش جــویی، دوری ز اشــکارش-چــون
اشــکار جــویی، محجــویی از نهــانش).. تــۆ بەچــاوی بــاوکێکی ڕیــش چەرمــووە
وە لە خەڵــک دەڕوانیــت و مــن لە تــویێی دڵەوە بە ئــازاری چکۆلانەیــان
پێکەنینم دێت..

ئـــازارێکی گەورە لە دڵتـــدایە.. مـــن دڵـــم ئێشـــێت...! تـــۆ پیـــاوێکی هەڵە نیـــت... تـــۆ لە شـــوێنێکی هەڵەدا نیـــت.. مـــن لە کـــاتێکی هەڵەدام..! تـــۆ (هەڵە)ت لە (ڕاســـت) پـــێ پەســـەندترە، لە (هەڵە)دا دەزانـــی شـــتگەلێک لە دنیـــادا هەن لە (ڕاســـت) زۆر خۆشـــترن.. تـــۆ تـــا ســـەرت هەڵـــدەگرێت هەڵە بفەرمـــوو و بەس بە مـــن مەڵـــێ "عەفـــوو..!" ئەزانـــم ژیـــانی هەمـــووان ســـەردابێکی داخـــراوە، بەس ئەوەی تـــۆ تووشـــاوتوونە، لەم تـــونێلە ســـارد و شیدارەدا سەرت قورسە و تەنیا.. زۆر تەنـــــیــــــا جێهێڵراوم.

سەگێک لە مندا دەوەڕێت..

دەســـت دەکەیـــنە ملـــی یەک و بەو کـــۆڵانە درێـــژ و تاریکـــانەدا دوور دوور پـــێکەوە دەچـــین بـــۆ پیاســـە.. ســـوپاس بـــۆ ئینســـافت، کەس وا لەگەڵ تەنیـــایی خـــۆی ناکـــات.. لەســـەر ســـکەیەکی ژەنگـــاوی پـــاڵ دەکەوم و تـــۆ دەخەمە ژێـــر شـــەمەندەفەرێکی ڕەش.. ژیـــان بە نامەکـــانی تـــۆ دەســـت پـــێ دەکـــات، کە ئێســـتا ئیتـــر نـــایەن و مەحـــاڵن، بەڵکـــو شـــتێک بکەیـــت ئەم مەحـــاڵە مەحـــاڵ نەبێـــت..! تـــۆ حەز دەکەیـــت هەمـــوو ئەو شـــتانە بکەیـــت، کە پـــێچەوانەی پرەنســـیپە ئەخلاقییەکـــانی خـــۆتن و مـــن عـــادەتێکی قـــۆرم گرتووە: چاوتروکاندنەکانی خۆم، ترپە خاوەکانی دڵت دەژمێرم؛

ئەوە نۆزدە...

ئەوە هەژدە..

ئەوە حەڤـــ..

ئاســـنگەرێک لەســـەری تـــۆ دا مانـــگ دەکـــوتێتەوە.. کاســـس بـــووم هێواااااااااشـــــــــ.. خەرێـــکە گەرد گەرد دەنیشـــێیت.. تـــا خـــودا حەز دەکـــات.. تـــا دڵـــت دەیگرێـــت تەنـــــــــــیـــــــــــــــــام. تـــۆ وەک دوورخـــراوەیەک دەژیـــت.. مـــن لە مـــاڵەچکۆلانەکەی خۆمـــدا نـــــــا، لەســـەر ئەم زەوییە دەستبەسەرم..

ئەم تەنیـــاییەت وەک کەلەبـــچەیەک بەخـــۆتەوە گیـــرۆدە کـــردووە.. هەزار جـــار بـــمەوێ فریـــووی بـــدەم، بیـــبەمە ســـەر کەســـێ، شـــتێ، شـــوێنێکی تـــر، ئەو هەر

فریــوم دەدات و دەمهێنێــتەوە ســەر تـــــــۆ، بە ئەســپایی چــاوم لێــک دەنــێم. بیــر لەوە دەکەیــتەوە کە ئــاوا نــاتبینم..؟ ئاهـــ کاشــکێ شــتەکان ئاوهــا ئاسـان بـان.. هەر بەڕاسـت ئەزانیـی مـن لە بەرانـبەر تـــــــۆدا چاوی خــۆمم لــێ دەبێــت بە بەڵا.. بە ســەری مێردێکــی باشــی ژنێکــی دۆســتت، بە مێشــی کــاڵەوبووی ســەر قــژت ســوێند دەخــۆم؛ لە قەرقەشـــەدایت، وەک یەکەم قــافی حەرفێکــی قەلەق.. تــۆ شــتێکی تــرت دەوێــت، شــتێکی تــر، شتێک کە نازانم چییە، بەس دەزانم دەمەوێت.. ڕەنگە ئازادییم بوێت....

ئازادیی..

ئازادیی..

بۆخۆم نــا، بۆ کەلەبچەکە.

غەمگینیی تۆ قفڵێکە چەندە سەرنجم لێداوە جێگا کلیلی نییە..

مـن بە (X) گەورە خۆشم دەوێیـت و تـۆ بە (n) سـمۆڵ نیگەرانمیـت.. تـۆ کۆشـکێکی گەورەیـت.. کۆشـکێکی جێهێڵـراو، کە هەمـوو ژوورەکـانی پـڕن پـڕ پــڕن لە مــن.. بە یەکەم ســێو، کە ئـــادەم گرتــی و بە یەکەم ســێکس و یەکەم هەڵەش، کە هەر ئەو کـــردی؛ مـــــــن بـــرین دەجـــنم و خـــوێن دەدڵــۆپێنم و ئــازار دەکەمە کاســەوە..! تــۆ بە بۆشــاییدا هەڵــدەڕوانی و لە خۆتــدا بەدوای شــتێکدا دەگەڕێیــت و دەڵێــی: ئەگەر لەســەرمەوەیت، ئەگەر لە خوارمەوەیــت، لە هەر شــوێنێک خــۆت حەشــارداوە و ســەیرم دەکەیــت..

ئەی نەفرەتیی؛

ئەم یارییە بووەستێنە..

تەواو...

تەواو..!

هــاتی و وتــت: "مــن زۆر بــاوەڕم بە خــودا نیــیە......." قورگــت گیرابــوو، دەتگـــــووت دەســـــتێکی غەریـــــب لە نـــــاوەوەڕا یەک یەک خەنـــــجەر هەڵــدەچەقێنێتە وشـــەکانت، کە لە زارت دەتــرازان ســـوور بـــوون، بـــۆنی خوێنیــان لــێ دەهــات، خــوێنێکی ئــاڵی تــازە.. شــتێک بینتــی گرتبــوو کە

وتـــت: "......بەلآم کە هـــاتم ســـەرم بەخۆمـــدا شـــۆڕکردەوە و وتـــم خـــودایە ئەگەر تۆ هەیت، وا بکە بەدڵی شکاوەوە نەڕۆمەوە..."

مـــــــن بووم، وامکرد بەدڵی شکاوەوە نەڕۆیتەوە!...

دەتەوێـــت لەبـــارەی خـــۆت و ئەو پیـــاوەوە بنووســـیت، کە پـــێکەوە ژنێکتـــان خـــۆش دەوێـــت، ئەم پەیوەنـــدییە ســـکپڕە بە شـــتێکی تـــر.. شـــتێک، کە پەلەت لـــێ نـــاکەم و ئەزانـــم ئێســـتا ناوترێـــت.. شـــەق لەزەوی هەڵـــدەدەیت.. تـــف دەکەیـــتە ئاســـمان.. بە هەمـــوو هێـــزم، ســـەری کاســـم دەکێشـــم بە بـــادا.. بـــۆ گوێناگری..؟ بۆ ساتێک سەرنج نادەیت.. ئەم بەندەیەت چەند تەنیایە ..

چ ه ن د . . چ

ه

ن

د

!...

تەنیایە

چ

ه

ن

د

چ ه ن د . . !...

درۆ دەکـــات ئەوەی دەڵـــێ ئێـــرە دەرگـــای تێـــدا نیـــیە، شـــارەکە ئەســـتانەیەکی گەورەیە ڕوووە جەهەنەم...! مـــن خـــوێنی چـــاخێکی تـــرم تێـــدایە و لە چاومـــدا مانـــگ گەنیـــووە..! خەونەکانـــت ئامـــاژەن، کە تـــۆ هێشـــتا بـــاش نیـــت.. مـــن ئەم شـــەقامەم ئەزبەرە.. تـــۆ ڕێبـــواری ڕێیەکـــی بنبەســـتی و مـــن ئەم جـــادەیە بەدوای خۆمـــدا ڕادەکێشـــم.. تـــۆ لەمســـەر بـــۆ ئەوســـەری شـــەقامەکە

هەر خـۆت دەبینیـت.. ئەوە بـۆ ئینسـان هەمیشـە لـووتی بە لـووتی ئەوانەدا دەتەقێـت، کە ڕقـی لێیـانە..؟ جـاران هەردووکمـان دەبـووین بە تـــۆ، ئێسـتا هەردووکمـان دەبـین بە مـــن. مـــن سـەرەتا و تـۆ کۆتاییمیـت.. ڕێـی تـــــۆ لە مـــندا دەسـت پـێ دەکـات و ڕێـی مـن لە تـۆدا تەواو دەبێـت.. بە دەنکـی قەڵەوی گەنمێـک سـوێند دەخـۆم دەبـێ بـڕۆم.. زۆر درەنگ کەوتوویت.. دەزانیی..؟

ئەم دیواری نائومێدیی چینـ ـە لەمندا هێندە درێژە..

هێندە درێژە..

هێندە درێژە.

"ئەرێ ئێوە ماڵتان لە کوێیە..؟"

خودایە باری شانم سووک بکە..

تـۆ جـاران شـتەکانت دەخسـتەوە جێگـای خۆیـان.. ئێسـتا دەبـێ ئەوە لەگەڵ خەڵکـدا بـکەم، مرۆڤـایەتی لەجـێ چـووە و "نابەجێ!"مـاوە.. تـۆ وەک گـورگێکی بریندار، لـوورەت دەڕژێـتە شـەوەوە.. مـن لە سـۆفیا نـیم، ئەو لە مندایە، ئیتر سفرە، نیوەتیرەی ئەم بازنەیە.. تەنگە ئینسان بیت؛

من

تەنـــیـــــام

تەنـــــــیــــــام

تەنــــــــیـــــــام

وەک

سـەگ..

٢٠١٢

ستۆکهۆڵم

# حیکایەتی مێش

**بۆ یەهودای ئەسخریوتی**

١

"حیکایەتی مێشت بۆ بگێڕمەوە؟

- بەڵێ..

مەڵێ: ((بەڵێ))!

- ئەی بڵێم چی؟!

مەڵێ: ((ئەی بڵێم چی))!!"

٢

یەهودا.. سەیری ناو چاوم بکە.. ئەو ئێوارەیەت بیر دێ کە لەخاچیاندام..؟!

سەر دامەخە.. وەڵام بدەرەوە..!

باوکم سەر ڕادەوەشێنی و بەنیگەرانییەوە دەڵێ: "نا، بەس ئەو بایە لەو کونەوە بێ...." من بە پرتاو خۆم دەکەم بە قسەکەی باوکمدا و دەڵێم: ژیان ناخۆشیش نییە، ئەگەر تاقەتت هەبێ دانەویتەوە و دابەزی..

دابەزی..

دابەزی بۆ ئاستی جرج!

یەهــودا.. لە زاری تــۆوە بەو وەحــدەهو لاشــەریکە لە..یە دەڵــێم؛ وەرە بە مەرجــی وەرنەگــرتنەوە، تەنیاییەکانمــان بگــۆڕینەوە..! خــۆی دەزانــێ؛ مــن پزیشــکی مــرۆڤم، بــۆ ئەوەنــا زامەکانیــان تیمــار بــکەم، بــۆ ئەوەی خــوێ بکەمە برینیانەوە.. (کەواتە)ی ناوێ، من تــەنــیــــــــام و من هەم.

یەهــودا.. تــۆ دەزانــی ئەوەی لە منــدایە دڵ نیــیە.. دووڕی یەتــیمە و بە شــــەوارەیان دەخــــات.. ئەوەی لە منــــدا دەدرەوشــــێتەوە ڕوونــــاکییەکی تــاریکە.. تــۆ دەزانــی ئــادەم بــاوکی مــن نیــیە و مــن لە قــوڕێکی تــرم..؟ مــن خۆم کوڕی خۆمم..!

یەهــودا.. تــۆم وا دەزانــی هەر جــارێ لەخــاچ دراوم..؟ نــــــا.. مــن چەنــد جــارێکی تــر مــردووم و زینــدوو بــوومەتەوە، قســەی حســابی هەر ئەوەیە؛ کە مــردن زۆ لێــرەش نــاخۆش تــر نیــیە.. یەهــودا.. تــۆ کۆنیــت بەڵام تــۆ چیرۆکــی یوســفت نەبیســتووە.. تــۆ نــازانی ژیــان لە کوردســتان تــونێلێکی قەپــاتە، مەنهــۆڵێکی داخــراو، خەڵکــی لە هەر شــتێ زیــاتر، چەقــۆ لە یەکتــردا ســەرف دەکەن.. بــۆیە بــێ دوودڵــی؛ ئەگەر خــوێڕی تــرین براکــانی دونیــا؛ ئەوانەی یوسف بن، خۆێڕی ترین برادەرەکانی دونیا؛ ئەوانەی منن..

یەهــودا.. بیــرت نەچــێ؛ لە داخــی خەراپتــرین برادەرەکــانی دونیــا، بیــرم بخەیتەوە؛

خــۆم بــخەمە ژێــر قیتارێــک لە خێرایــی ٣٠٠٠کــم لەسەعاتێــ... تــا ٣٠٠٠کــم لە نیگەرانییەکدا.

ســـەیری خـــۆم دەکەم؛ ئەوەی لە منـــدا دێـــت و دەڕوات، خـــوێن نیـــیە، قەتــرانە.. یەهــودا.. کتێــبە کــۆن و زەردەکــان مۆتــاڵا دەکەم و وێڵــی دوای خــودایەکم ئینســان بپەرستــێ و پێــی بڵــێم: شــاهیدی دەدەم کە تــۆ هەیــت و حەقیت..! حەیف کە ئێستا نییە و وەهمە.

یەهــودا.. مــن کە دڵــم تەنــگ دەبــێ؛ بە تەنیــا لە گــوێ چەمێکــدا دادەنیشــم و ئـــاو دەژەنـــم.. بـــڕوانە؛ ئەســـتێرە وەک پســـەری بـــێ بـــاوک، ڕژاونەتە ئاســـمانەوە..! تەماشـــاکە؛ ســـەگێکی ڕەش کچێکـــی ســـپی بـــردووە بـــۆ

پیاسـه.. جـا لە کـوێی مەجـدەلییەی مـن؛ لە هەزارپیشـەی ئومێدتـدا بـۆم هەڵچنیـت؛ چینچـین.. قاتقـات.. ئەم کراسـە دڕاوانەی نائومێـدییم..؟!
مـریەم.. مـن نـامەوێ تـۆ لە قەفەزی پێـنج پیتـدا دیل بیـت.. بـۆیە هەرجـارە پیتێک ئازاد، هەر جارە فۆنیمێکت بەرەڵا دەکەم..
یەهـودا.. مـن لە چاوەڕوانییـدا دەمـرم.. بەیـانییەک لە خەو هەڵدەسـتم و تەماشـا دەکەم؛ مـردن ئـازیزێکی تـری بـردوین، دە وەرە مـن بە تەمـای کـێ بووم..؟! مـردن بۆ مـردن.. مـردن بۆ من..!

٣

یەهـودا.. تـۆ دەزانـی ئێسـتا.. هەر ئائێسـتا دەڵـێم.. هەزار سـەگ پـێکەوە لە سەرمدا دەوەڕن...؟!!!
مـن نـامەوێ دونیـا بگـۆڕێ.. ئەگەر بگـۆڕێ، ڕێ دەرنـابەم، دەبـێ بـبم بە پیـاوێکی مـوحتەرەم، کە نـاتوانم بـبم.. ئەوەی لە منـدا دەگـوزەرێ، کـانییەکی تـازەیە، کە ئـازارێکی سـازگاری لـێ هەڵـدەقوڵێ.. یەهـودا.. مـن حەز دەکەم زەوی هەشـت جـار لەتلەت ببێـت.. هەپـرون بەهەپـرون.. بەڵام بە دەستی ئینسان نـا...!
یەهـودا.. جارێـک بـۆ ئەوەی بیتـۆرێنم؛ بەکچـێکم گـوت: دونیـا خۆشـە وەک مـۆز لە دەمـی تەڕی تـۆ و قەیسـی لە زاری وشـکی منـدا.. بەڵام نەتـۆرا..!
ئـاوام یەهـودا.. گەردون لەمنـدا ئێشـێت.. حەزدەکەم دونیـا بتـۆرێنم.. بەڵام مـن بـۆ نەچـم شـەوێکی درەنـگ سـەربخەمە سەرشـانی و بە هێواشـی لێـوم بە گەردنـیەوە بنووسـێنم و ئەو بـۆ نەیەت و بە چـرپە پێـت بڵـێ: "فڵانـی... دەزانی تۆ هەزار پیاویت لە پیاوێکدا..؟!"
تۆ کوردی دەزانی، کوردی..؟!!
دەمن زۆر تەنیام............!

یەهــودا.. ئەم گــۆرانییە ئــاخری دەمانکوژێــت.. ئێســتا بیــری نیــیە؛ کە کاسێتە قـاوەییەکەی بـۆ هێنـام، وەک یاسـەمینی نـاو شـامپۆکەی ئەو کـات، قــژی خســتبووە ســەر لا، گــوڵێکی لە کەزێــی دابــوو، کە ئێســتا دوای ئەو هەمــوو ســاڵە لە زەینــی منــدا ئەوەنــدە کــاڵبۆتەوە، ڕەنــگەکەی ناناســمەوە.. کەچی بەرامەی سەری پڕ کردووم!

یەهــودا.. خۆشــە: هەســت بکەیــت؛ ئەوەی ســەر خــاچەکە تۆیــت..؟ ئەوەی زەوی لەگەڵــی بــێ وەفـا بــوو..؟ ئەوەی ئاسـمانیش جێـی هێشـت..؟! هـا..؟ وەڵامم بدەرەوە، خۆشە..؟!!

٤

ئاهـ من چەند قەرەباڵغ و چەند تــەنــیـــام خودایە.

یەهــودا.. مەنفـا خۆشــە.. بەڵام ئەوەی لێرەبــێ و بیــری نیشــتیمان بکــات دەمــرێ.. دڵــت لام نەبــێ ئەوە مــن نــیم..! بیــرتە شــەوێکی بەفــراوی مــریەم بە قــژی تەڕەوە خــۆی کــرد بە ژوورەکەمــدا و وتــی: "دوای نەڵێــی پێــی نەوتــم؛ ئــالودەبوون بە ماجیــدە ڕومــی وەک موعتــاد بــوون بە هێــرۆیین وایە"..؟! یەهـودا.. خـۆ ئێسـتا نییە، تـا پێـی بڵـێم: کچـێ مـن غەریبم، بەڵام غەریبی سەخت نییە.. سەخت ئەوەیە تــــۆی لێ نیت..!

بەو خودایەی ئاگای لە دڵەکانە؛

یەهــودا.. قســەکردن لەگەڵ مــریەم؛ بێــدەنگی و بێــدەنگی؛ لەگەڵ مــریەم قسـەکردنە.. کە تۆیـان کـرد بە خـاین، دەیانوسـت لەجێـی تـۆ؛ میتیـاس لە عەرشــی دڵیانــدا دانــێن و داشــیاننا.. دەیبینیــت؛ جــامی پــڕ لە دەســتمدا خــاڵییە..؟ هەمــوو زۆرێکـم پـێ کەمە.. دەیبینیـت؛ خـۆ هەر مـن نـیم؛ هەمـوو ئەوانەی دەزانــن بــاش قســە بــکەن، نــازانن بــاش بــژین.. یەهــودا.. بیــرم بــخەرەوە دوای چیرۆکــی براکانــت بــۆ تەواو بــکەم.. ئەڵێــی شــتێکم ون

کــــردووه، ئەڵـــــی وێڵــــی دوای شـــتێکم.. بیـــر لەوە دەکەمەوە ڕێ بەرم بـــۆ هیندستان.. بەڵکم خوایا پیرم لەوێ بێ و تـــۆ بڵێ: ئـــــامین!

یەهـودا.. مـن لێـرەبم یـان لە ئورشـەلیم؛ نـوێنەری غەمـی هەسـارەیەکی تـرم لەسەر زەوی..

من؛ باڵوێزی نائومێدییم..!

من ڕووناکی هەڵدەمژم و بیری خۆم دەکەم.. خۆم لەلای تـــــۆ..!

یەهـودا.. بیـرت دێ بە سـی سـکەی زیـو منـت فرۆشـت..؟ سـی سـکە.. سـی سکە.. سی سکەی حیز..

بەڵام ئێسـتا ئیتـر نـامەوێ نە بـۆ خیـانەتی تـۆ و نە بـۆ دەسـتی مـریەم و نە بـۆ هـیچ گەوادێکـی تـر خـۆم بکـوژم.. خۆکوشـتن سـزادانی خـۆتە بە تاوانێـک کە ئەوانی تر کردویانە..!

٥

بـا کریستۆسـی سـەرخاچەکەش مـن بـم.. خـۆ بەدەسـت خـۆم نیـیە، هەر بیرت دەکەم..!

یەهـودا.. مـن وەک سـۆفیا ڕێگـایەکی داخـراوم.. بە دەگـمەن خەڵـک دێـنە مـنەوە، بەڵام نـاوەوە قەفەسـە، بـا هـیچ مەجـدەلییەکی تـر نەیە و کە هـات خەیـاڵی خـاوی ڕۆیشـتن لەسـەری جەنجـاڵی خـۆی دا دەرکـات.. چـونکە ئەو خـودای تەعـالایە ئەم قەفەسـەی وا خـراپ دروسـت کـردووە؛ کە هەر یەکجـار دەرگاکەی باز دەبێ..!

چـی بـکەم؟ ئەم دەرگـایە دەکەمەوە و ئاشـنـاییت لەتەک دا ئەخەم.. سـەرم لە خەڵکـێ ئاوسـاوە کە پێـدەکەنێ.. مـن لە قـوڕی تـۆ نـیم.. مـن لە هەویرێکـی تـرم؛ لە مەعجـوبەی ئـازار..! ئەمـڕۆ خراپتـرین ڕۆژی مـنە، لەوە خراپتـر ئەوەیە سـەرم دەخـورێنم و چـاوەڕێی ڕۆژێکـی خراپتـرم.. مـن بـرین دەجنم و خوێن دەدڵۆپێنم و ئازار دەکەمە کاسەوە..

یەهودا.. شتێکت پێ دەڵێم.. بەس بە کەس مەڵێ؛
سەرم پڕە لە چەقۆۆۆ...!!!
یەهودا.. مریەم حاڵی بکە بە خوفییە؛ کە بێ غایەت پەرێشانم و جێیهێشتووم.. وەک چۆن خودا مرۆڤی جێهێشتووە.. بەڵام قەینا یەهودا.. هەر ئێمە خودامان نییە.. خوداش ئێمەی هەیە.. حەیفی ئەوەم لێ دێ؛ من لە زەوییەکدا دەژیم لەژێریدا کرم و لەسەریدا جرج و لە ئاسمانیدا قەلەڕەش هەیە.. ئەسخریوتی.. ئەوەی بە ئینسان دەڵێ جوان، یان کەرە یان شاعیر..!
حەزم دەکرد خانمی پیلاتۆس لە خاچم بدات.. بە خاچێک کە لە ملی دایە.. یەهودا .. خۆ بەوە نییە؛ لای چەپە، من خۆم دەزانم؛ هەر دڵم ڕاستە.. کاهینەکانی پێش منیش دەیانگوت: دەبوو خودا هەندێ حسابی تری بکردایا.. بەڵام ئێستا کە ئەو نایکات، من دەبێ بیکەم، حسابە ئیتر..!! حسابی شاردنەوەی ئەو لە باجوەرگرەکان لە پەستێوی خەزنە کۆنەکانی دڵما.. خۆ ئەو موحەمەد نیت بانگی بە ئاشکرا خۆش بێت، من حەز دەکەم کەس نەزانێ کە بیر لەو دەکەمەوە..!
ئەسخریوتی.. قوڵپ ئەدا ئەم قەلەقییەم و بە هەموو هێزم؛ بە خێرایی ڕووناکیی خۆم دەکێشم بەم کاکێشانەدا.. تۆ نازانی لە حەسرەت هیجری مریەم؛ شەوان من چیم لێ دێ..؟ ئەم شەو لە خەونمدا دووپشک دەباریی..!! و دایکم ئیبن سیرین موتاڵا دەکات و دەڵێ: "خودا بەخێری دەگێڕێ ئیشەڵڵا"..
یەهودا.. تۆ بە (ئارامی) دەئاخفێی شتێک دەڵێم، ڕەنگە تێنەگەیت؛ بەس دەزانی (ئازار) بە (کوردی) خۆشترە..؟! ئێواران قۆڵ دەکەم بە قۆڵیدا، بە تەنورەیەکی کاڵی کاوبۆی کورتەوە، ئەو جادەیە دەخاتە ژێر نازی خۆیەوە، خەڵک تەماشامان دەکەن.. دەزانم هەمووان ئیرەیی بە من دەبەن کە دەتوانم، هەموو شەوێ بتبەمەوە ماڵەکەی خۆم؛ ئەی تەنیایی..!!

یەهودا.. نائومێدیی من لە مریەم، نائومێدیی نییە لە پێنج پیت..
نائومێدیی نییە لە هەموو ئەو پیتانەی ناوی ژنەکانی دونیا پێکدەهێنن،
نائومێدیی من لە مریەم؛ نائومێدییە لە ئینسان!

کوڕی ناپاکی جەلیلییە.. دەبێ بزانی؛ من هیچم لە خەڵک زیاتر نییە،
دڵتەنگییەکەم نەبێت.. دەزانم قوڕە، بەڵام یارییەکی ئەوەندەش ناخۆش
نییە ژیان، ئەگەر تاقەتی چاوەڕوانیت هەبێت..!

گێژبووم بەدەست ئەم هەموو مێشەوە؛ هەمووان مەراقیان ناوگەڵی ژنێکە
و من مەراقی ناوگەڵی جیهانم.. سەرم پڕە لە قالۆنچە.. وا بەدوای یەکدا
بە پێچپێچەکانی گوێمدا دێنە دەرێ و ئەم بالیفە سپییەیان ڕەش
کردووە.. پێوەم دەدەن.. هەموویان بەیەکەوە و لە یەک کاتدا قەپاڵ
دەگرن..!

وەک ئادەمیزادێ دەمەوێت لە خۆم دەرچم و بچمە قەرەباڵغی ئێوارانی
گەراژێک، لە ناو عەشاماتێک ڕێبواری ژانتابەشاندا خۆم ون بکەم. بە
دزی دونیاوە سوار پاسێکی کۆنی درێژ ببم و لەگەڵ ئەو موسافیرانە بچم
بۆ شوێنێک، شوێنێک کە نازانم کوێیە..!!

یەهودا.. جا دەکرێ هەر وەرزێک، یەکێ جێتبهێڵێ و یەکێ خۆیت
پیاهەڵواسێت..؟ ئا، دەکرێ.. بەمە دەڵێن: ژیانی دراو..!

خودایا.. من لەم بەرهەمە جوانەت کە ناوی ئینسانە؛

نائومێدم

نائومێدم

نائومێدم.. و ناوی خۆم دەگۆڕم بۆ شتێ کە
خەیاڵی دروستکردنی هێشتا لەسەری خەلیقەتدا نییە..!

لە زانکۆم.. مامۆستا نیگای گلەیی دەچەقێنێتە چاوم.. دەزانێ ئەمڕۆ
لێرە نیم.. دەزانێ ئەمڕۆ باش نیم.. دوێنێش باش نەبووم.. سبەینێشم
لە ئەمڕۆ و دوێنێم ڕۆشنتر نییە.. هیچ نالێ.. هیچ نالێم.. بە دوو سێ
توولەڕێی بەردەڵانی سەختا وەک ڕێمان ونکردبێ خواروژوو دەکەین..

من ڕوو وەردەگێرم.. لە تـــۆ نـــا.. لە خۆم ڕوو وەردەگێڕم..!
ئەی پیاوێــک کە منــت فرۆشــت.. ســەیربکە؛ بەم عەســرە، ســەرم پــڕە لە گوێزان..!
تەواو... ئەی خۆکوشــتن.. ئەی دۆســتی شــیرین، ئەی هــاوڕێی نیــانم.. ئەی ئەستێرەی سیوەیلی بەختـی مـن.. مـن ئیتـر چـاو دەبـڕمە نـاو چـاوی تـۆ..!
بیـــر لە ســـەگێکی قـــاوەیی گەورە دەکەمەوە لەســـەری خۆمـــدا و هـــیچ قســەیەکم بــۆ بەشــەرییەت نیــیە، ئەو بەشــەرییەتەی بە (ب)ی بــێ قیمەتــی دەست پێ دەکات..
یەهـودا.. ئێسـتا دەڵێـی چـی دوای حیکـایەتی مـێش، حیکـایەتی خۆمـت بـۆ بگێڕمەوە..؟

**٢٠١٤**

**ستۆکهۆڵم**